جولی ئوتسوکا

# ئێمە زەریامان بەزاند

دلاوەر قەرەداغی

ENDESE

ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە

بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: سیروان مەحمود

بەڕێوەبەری هونەری: باسم ڕەسام

ناوی کتێب: ئێمە زەریامان بەزاند

(ناونیشانی ئۆرگینالّی ئەم ڕۆمانە: "The Buddha in the Attic بودای ناو هەورەبانەکە" یە)

ناوی نووسەر: جولی ئۆتسوکا

وەرگێڕانی لە سوێدییەوە: دلاوەر قەرەداغی

بەراوردکردنی لەگەڵ دەقە ئینگلیزییەکەدا: ژوان شوانی

بابەت: ڕۆمان

دیزاینی تێکست: دانا حەسەن

نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٥

چاپخانە: پەنجەرە

تیراژ: (١٥٠٠) دانە

نرخ: (٥٠٠٠) دینار

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٣٣٦)ی ساڵی (٢٠١٥)ی پێ دراوە.

ئەم کتێبە لەم سەرچاوەیەوە کراوە بە کوردی:

Vi kom över havet, Juli Otsuka
Översättning av Ulla Roseen
Bonnier Pocket 2013



ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە/ ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

سلێمانی–شەقامی مەولەوی–تەلاری سیروانی نوێ–نهۆمی چوارەم

www.endeshe.org ● andesha.library@yahoo.com

http//www.facebook.com/Andeshacenter

07501026400

# یەك دوو وشە...

ساڵ ساڵی ١٩١٩ یە. کەشتییەک بە سەر «زەریای ئارام» ـەوەیە. کۆمەڵێک کچی گەنج لە خوارەوە لە تاریکییەکی ئەنگوستەچاو و لەسەر تەختەخەوی شەقوشڕ لە بنی ئەرشی کەشتییەکەدا ترانجاونەتە ناو یەکتر. باوڵەکانی سەفەریان پڕە لەو کەلوپەلانەی کە لە ژیانە تازەکەی ئەوبەر زەریایاندا پێویستیانە: جلکی کیمۆنۆی ئاوریشم بۆ شەوی بووکێنیی، فڵچەی خۆشنووسیی، کاخەزی برنج تا نامەی بۆ ماڵەوە تێدا بنووسن، فیگوری بچووک بچووکی بودا لە مس بۆ بەخت و چاوەزار و خۆپاراستن، نامە و فۆتۆی ئەو پیاوە غەوارانەیان بە دەستەوەن کە بڕیارە هەر بگەنە ئەوبەر زەریا ببنە مێردیان، نامەی پیاوانێک کە گفتیان پێداون لە ئەسکەلەکەی سان فرانسیسکۆ چاوەڕێیان بن. کچەکان خەون بە ئایندەوە دەبینن. بەڵام ئەوەی لەوبەر زەریا و لەو وڵاتە نوێیەدا چاوەڕێیان دەکا؛ پیاوانێکن کە پیاوی ناو فۆتۆکان نین، ژیانێکی دژوار چاوەڕێیان دەکا، کە ئەمان هەر مەزەندەشی ناکەن٘و بەر کولتوورێک دەکەون کە هەوڵ دەدەن تێی بگەن.

(ئێمە زەریامان بەزاند) پۆرترەیتێکی شیعریی چارەنووسێکی بە کۆمەڵە کە ژمارەیەک کەسێتیی جودا جودا بە شێوازێکی هەژێنەر دەیگێڕنەوە. جولی ئۆتسوکا لێوانلێو لە هەستوسۆزو بە دیقەتەوە ژیان دەبەخشێتە

ئەو ژنە ژاپۆنییانەی کە لە دەیەی بیستی سەدەی ڕابردوودا بە نامە شوو دەکەن و بۆ کالیفۆرنیا دەڕۆن. ڕۆمانەکە ژیانی ئەو ژنانە هەر لە یەکەم ڕۆژی سەفەرە تاقەتپڕوکێنەکەیانەوە بە کەشتیی، تا ئەو ڕۆژەی مانگی دیسەمبەری ساڵی ١٩٤١؛ کە بە خاووخێزانەوە و بە گومانی سیخوڕیی کردن بۆ ژاپۆن، کۆدەکرێنەوە و ڕادەگوێزرێن، لەخۆ دەگرێ. لەم ڕۆمانەدا بەشێک لەو ڕووداوانەی مێژووی نوێ دەگێڕدرێنەوە؛ کە کتێبەکانی مێژوو بیریان چووە یاخود نەیانویستووە بینووسنەوە.

خاتوو جولی ئۆتسوکا، ژنە ڕۆماننوسی ژاپۆنی – ئەمریکایی، لە ١٥ی مەی ١٩٦٢ لە پالو ئالتو، کالیفۆرنیا لەدایک بووە. ئۆتسوکا نێوبانگی بە نووسینی چیرۆککگەلێکی مێژووییەوەیە کە لەسەر ژیانی پەنابەرانی ژاپۆنیی لە ئەمریکا، ڕۆنراون. یەکەمین بەرهەمی ئۆتسوکا کورتە ڕۆمانی (کاتێ قەیسەر خودایی بوو) لە ساڵی ٢٠٠٢. دووەمین ڕۆمانیشی (ئێمە زەریامان بەزاند)ە، کە وێڕای سویدی، تەرجەمەی ئەڵمانی و فەڕەنسیش کراوە و خەڵاتەکانی فۆکنەر و **Prix Femina** ی فەڕەنسی وەرگرتووە و کاندیدیش کراوە بۆ وەرگرتنی خەڵاتی National Book Award.

هەندێک ناو دەگەنە گوێی نەوەکانی داهاتوو
قسەوباسیان لەبارەوە دەکرێ و ستایش دەکرێن
هەندێک ناوی تر بیر دەچنەوە و بزر دەبن
وەک ئەوەی هەرگیز نەبووبن،
وەک ئەوەی هەرگیز نەژیابن،
منداڵەکانیشیان... وەک خۆیان.

سیفری یەشوع بن سیراخ ٤٤-٨-٩

کادانەکە سووتا
ئێستا دەتوانم مانگ ببینم.

هیرات ماساهیدا

# ژاپۆنییەکان... وەرن!

لە کەشتییەکەدا، زوربەمان کچانی پاقیژە بووین. پرچمان ڕەش و درێژ، پێوپلمان پان و زل و بالآشمان هیچ بەرز نەبوو. هەندێکمان لە منداڵیدا جگە لە شۆربای برنج، دەممان لە هیچی ترەوە نەدابوو، هەر بۆیە ئێسکمان خوار و نەرم بوو، هەندێکمان تەمەنمان چواردە ساڵان و هێشتا کچێکی بچووک بووین. هەندێکمان خەڵکی شار بووین و جلکی جوانی شاریمان لەبەردا بوو، بەڵام زوربەی زۆرمان هەمان ئەو کراسە کۆن و ڕەنگبواردووە پینەکراو و چەندجار ڕەنگکردووانەمان لەبەردا بوو، کە لە خوشکەکانمانەوە بۆمان مابوونەوە و لە ساڵانێکی زۆر لەوەوبەرەوە، لەبەرماندا بوون. هەندێکمان لە چیاوە هاتبووین و قەت لەوەوبەر لە وێنەدا نەبێ، زەریامان نەبینیبوو، هەندێکمان کچانی ماسیگران بووین و هەموو ژیانمان لە نزیک زەریاوە بەسەر بردبوو. ڕەنگبێ برایەک، باوکێک یان دەسگیرانێکمان لە زەریادا لەدەست دابێ، یاخود دەشێ کەسێک کە خۆشمان ویستووە، لە بەیانییەکی نەهاتدا خۆی هەڵدابێتە ئاوەوە و هەر سووکوباریک بە مەلە بەرەو جێگەیەکی دوور ڕۆیشتبێت، وا ئێستاش کاتی ئەوە هاتبوو، ئێمەش درێژە بە ڕۆیشتن بدەین.

لە کەشتییەکەدا، یەکەم شتێک کە کردمان، بەر لەوەی بڕیار بدەین حەزمان لە چی و لە چی نییە، بەر لەوەی بۆ یەکتری باس بکەین کە هەریەکەمان لە کام دوورگەوە هاتووین و بۆچی هاتووین، تەنانەت

بەرلەوەی لە ناوی یەکتریش بپرسین، یەکەم شتێک کە بەر لە هەموو ئەوانە کردمان، ئەوە بوو، فۆتۆی مێردەکانی ئاییندەمان پیشانی یەکتر دان، پیاوانی ناو فۆتۆکان جوان و گەنج بوون، چاوانیان ڕەش و قژیان زۆر، ڕووخسارِیان نەرم و بێخەوش. چەناگەیان بەهێز و شێوەیان گونجاو. کەپوویان ڕێک و بارِیک. هەر تەواو لە برا و باوکانی خۆمان دەچوون، تەنها ئەوە بوو، کە ئەمان جلکی باشتریان لەبەردا بوو، بلوسی ڕەساسی و چاکەت و پانتۆڵی خۆرئاوایی و هێلەک. هەندێکیان لەسەر پیادەڕۆکان لە بەردەم خانووی لە شێوەی پیتی A ڕۆنراو بە گوڵبێنەی سپی و چیمەنی جوان و بڕدراوەوە ڕاوەستابوون، هەندێکیان لەو شەقامە فەرعییانەدا، کە دەچوونەوە سەر جادە گشتییەکان، ڕاوەستابوون و پاڵیان بە ترومبێلی تی فۆردەوە دابوو. هەندێکی تریشیان لە ستۆدیۆکاندا لەسەر کورسیی تۆکمە و پشتبەرز دانیشتبوون و دەستیان بە نازکییەوە لەیەک ناو و لە زوومی کامێراکانیان دەنۆڕین، وەک ئەوەی ئامادە بن دونیا بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە. گفتیان دابوو کاتێ ئێمە دەگەینە بەندەر، ئەوان لەوێ، لە سان فرانسیسکۆ بن و چاوەڕێمان بن.

لە کەشتییەکەدا، زۆر جار لە خۆمان دەپرسی: بڵێی ئەو پیاوانەمان خۆش بوێن؟ بڵێی عاشقیان بین؟ بڵێی هەر کە لە لەنگەرگەکە دەیانبینین، بە ڕەسمەکانیاندا بیانناسینەوە؟

لەبنی ئەرشی کەشتییەکەدا، لە جێگەیەکی پیس و تەڕدا دەنوستین. قەرەوێڵەکانمان لە ئاسن، بارِیک و لەسەر-یەک-دانراو، دۆشەکەکانمان ڕەق و تەنک و پەڵەپەڵاوی بە پەڵەی ڕەشی سەفەرەکانی تر و ژیانەکانی تر، سەرینەکانمان بە گەنمی وشک ئاخنراو، ڕاڕەوی نێوان کابینەکانی نوستن، پیس بە پاشەڕۆی خۆراک و ئەرزەکەش تەڕ و خلیسک. بنی ئەرشی کەشتییەکە، یەک تاقە کونجی هەواکێشی تێدا بوو، ئێواران کاتێ دەریچەکە دادەخرا، ئیدی تاریکییەکە پڕ لە چپەچپ دەبوو. یەکێک بە چپە

دەیگوت: هیچ کوێت دێشێت؟ جەستەکان لەژێر بەتانییەکاندا کەلەکەیان دەگۆڕی و خۆیان گرمۆڵە دەکرد. زەریا هەڵدەچوو و دادەچوو. هەست دەکرا هەوا شێدارە و خنکێنەر. شەوانە خەونمان بە مێردەکانمانەوە دەبینین. خەونمان بە سۆڵی تەختەییی نوێ و تۆپەقوماشی ئاوریشمیی لەبن نەهاتووی نیلییەوە دەبینی و خەونمان بەوەوە دەبینی، ڕۆژێک لە ڕۆژان لە خانوویەکدا دەژین، کە گوڵبێنەی هەیە، خەونمان دەبینی جوان و بەهێزین، خەونمان دەبینی بۆ ئەو مەرەزانەمان دەگەڕێینەوە، کە زۆر نائومێدانە بەپەرۆش بووبووین جێیان بهێڵین. خەون بە مەرەزەوە هەمیشە بۆ ئێمە خەونی مۆتەکاوی بووە. خەونمان بە خوشکە گەورەتر و جوانترەکانمانەوە دەبینین، کە لەپێناو ئەوەدا ئەوانی ترمان نانی شێومان هەبێ، باوک و براکانمان بە خانەکانی گێشایان فرۆشتبوون، کاتێکیش لە خەو وەئاگا دەبووینەوە، بۆ هەوا هەناسەبڕکێمان پێ دەکەوت. یەکێکمان دەیگوت: *بۆ ساتێک وا مزانی بوومەتە خوشکەکەم.*

ڕۆژەکانی سەرەتا لە کەشتییەکەدا، سەرەگێژەی زەریا لێی داین، خواردن لە زگمانا ڕاگیر نەدەبوو، دەبوو پەیتاپەیتا خۆمان بگەیەنینە لێواری کەشتییەکە و بڕشێینەوە. هەندێکمان ئەوەندە گێژ بووین، کە نەماندەتوانی بچینە سەرەوە، بەڵکوو لە کابینەی خەوەکانماندا ڕادەکشاین و نیوەبووراوە لە خەوێکی قورسدا ڕۆدەچووین، بێتوانا لە وەبیرهێنانەوەی ناوی خۆمان و کەمتریش لە ناوی مێردە تازەکانمان، بە یەکدیمان دەگوت: ئادەی جارێکی تریش بیڵێ، من خاتوو کێم؟ هەندێکمان دەستمان دەگرت بە زگمانەوە و بە دەنگی بەرز هاواری کانوون، هاواری خواوەندی بەزەییمان دەکرد و دەمانگوت: *ئەرێ لەکوێیت؟* ئەوە لە کاتێکدا، کە هەندێکی ترمان وامان پێ باشتر بوو، ڕووخسارمان لە بێدەنگیدا سەوز هەڵبگەڕێ. زۆر جاران نیوەشەوان، توند لە داکشانێکی بە هۆی زەریا ڕادەپەڕین و بۆ ساتێک نەماندەزانی لەکوێین، یان بۆچی

تەختەخەوەکانمان دەلەرنەوە، یاخود بۆچی دڵمان ئەوەندە زەندەقچووانە وەتەپە کەوتووە. *بوومەلەرزە* یەکەمین شتێک بوو، کە مەزەندەمان کرد. بەدەم خەوەوە خۆمان بەدوای دایکماندا درێژ کرد، کە تا ئەو ڕۆژەی ماڵەوەمان جێ هێشت، لە ئامێزیاندا دەنوستین. دەمانگوت: بڵێی ئێستا دایکانمان نوستبن؟ بڵێی خەون ببینن؟ ئایا بەدرێژاییی ڕۆژ بیرمان لێ دەکەنەوە؟ ئایا هێشتا لە شەقامەکاندا بە باوەشێک زەرفەوە، سێ هەنگاو لەدوای باوکانمانەوەن، کە هەر هیچیان بە دەستەوە نییە، دەڕۆن؟ بڵێی لە ناخەوەڕا ئیرەییمان پێ ببەن لەبەر ئەوەی سەفەرمان کردووە؟ ئاخر ئەوان پێیان گوتبووین: هەموو شتێکمان داوە پێتان؟ ئایا بڵێی لەبیریان بێ کراسە کۆنەکانمانیان هەڵخستبن؟ بڵێی لەبیریان بێ پشیلەکان خۆراک بدەن؟ ئایا هەر بەڕاستی هەموو ئەو شتانەیان بۆ باس کردووین، کە دەبوو بیانزانین؟ پێیان گوتبووین: *کوپی چاکە بە هەردوو دەست بگرن، مەچنە بەر هەتاو، هەرگیز زیاد لە پێویست قسە مەکەن.*

لە کەشتییەکەدا زوربەمان خۆمان زۆر بە شایان دەزانین و دڵنیا بووین دەبینە کەیبانووی باش. دەمانزانی چێشت لێبنێین و جلک بدوورین. دەمانزانی چا دابنێین و گوڵ بکەینە چەپک و بەبێ ئەوەی چ شتێکی گرینگ بڵێین، بە سەعات لەسەر پێ پان و زلەکانمان ڕاوەستین. دایکانمان ئامۆژگارییان کردبووین: کچ دەبێ لە شوێندا بتوێتەوە، کچ پێویستە هەبێ بەبێ ئەوەی ببینرێ. دەمانزانی دەبێ چۆن لە ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنەکاندا ڕەفتار بکەین، چۆن شیعری کورت و غەمگین، ڕێک حەڤدە بڕگەی درێژ، لەبارەی تێپەڕینی پاییزەوە بنووسین. دەمانزانی گژوگیا بژار بکەین، دەمانزانی چیلکە دەر بکێشین و ئاو بهێنین. یەکێکمان – کچی ئاشەوانەکە – دەیزانی چۆن فەردەیەک برنجی چواردە کیلۆیی بە کۆڵیدا بدا و بەبێ ئەوەی هەر هیچ ئارەقە دەر بدا؛ بە پێی پیادە سێ کیلۆمەتر ڕێگە بەرەو شار ببڕێ. دەیگوت: *شتەکە تەنیا پەیوەستە*

بەوەوە کە چۆن هەناسە دەدەیت. زوربەمان هەر زۆر جوان پەروەردە کرابووین و بە شێوەیەکی بەرچاو بەئەدەب بووین، جگە لەو کاتانەی کە وەک زەریاوانەکان هەڵدەچووین و دەکەوتینە جنێودان. زوربەمان وەک ژنانی خانومان، زۆربەی کات بە دەنگێکی تیژ دەدواین و وا خۆمان دەنواند زۆر کەمتر لەوە دەزانین کە لە ڕاستیدا دەیزانین. هەموو جارێک کە بە لای زەریاوانەکاندا دەڕۆیشتین، ئاگادار بووین بەئەسپایی و بە هەنگاوی بچووک و لەسەر نووکی پێ بڕۆین. ئاخر دەیان جار دایکانمان ئامۆژگارییان کردبووین: *شارییانە بە ڕێگەدا بڕۆن، نەک لادێیانە!*

لە کەشتییەکەدا شەوانێکی درەنگ لەسەر قەرەوێڵەی یەکتر کۆ دەبووینەوە و لەوەی سەرەوەیان دادەنیشتین و بۆ ماوەی چەند سەعاتێک لە بارەی ئەو کیشوەرە نەناسراوەوە کە بۆی دەڕۆیشتین، سەری قسە و وتووێژی بێکۆتاییمان دادەمەزراند: گوایە دەڵێن خەڵک لەوێ لە گۆشت زیاتر هیچی تر ناخۆن و هەموو لەشیان بە تووک داپۆشراوە (ئێمە زوربەی زۆرمان بودایی بووین، گۆشتخۆر نەبووین و تووکیش تەنها بەو شوێنانەی جەستەمانەوە بوو، کە دەبوو تووکیان پێوە بێت.) بیستبوومان درەختەکانی ئەوێ هەر زۆر زەبەلاحن. دەشتەکان بەرفراوانن، ژنانیان دەنگ زل و بەژن زراڤن، پێیەک لە درێژترین پیاوی ئێمە درێژترن. زوبانەکەیان دە هێندەی زوبانەکەی ئێمە قورسە و نەریت و خوویان بە شێوەیەک کە ئەقڵ نایبڕێ، سەیرە. کتێبەکان لە دواوەڕا و پێشەوەڕا دەخوێننەوە و سابون بۆ خۆشتن بەکار دێنن. لەوێ بنیادەم لە پەڕۆی پیسدا فنگ دەکا و پاشان دەیئاخنێتەوە گیرفانی، دووبارە دەری دێنێتەوە و دیسان بەکاری دێنێتەوە. پێچەوانەی سپی لای ئەوان سوور نییە، بەڵکو ڕەشە. بیرمان دەکردەوە ئاخۆ دەبێ لە وڵاتێکی ئاوها بێگانەدا چیمان بەسەر بێت؟ خۆمان دەهێنایە بەر چاوی خۆمان – خەڵکانێکی کوڵەبنە کە تەنها پشتمان بە نامیلکەی ڕێنوێنیی گەشتیاری بەستووە،

بۆ وڵاتی زلحۆرتەکان دەچووین. دەمانگوت بڵێی پێمان پێبکەنن؟ بڵێی تفمان لێ بکەن؟ یان لەوەش خەراپتر: بڵێی قەت قەت بە جیدی وەرمان بگرن؟ بەڵام تەنانەت خانەگومانترین کەسیشمان ناچار بوو دان بەوەدا بنێ، شوو بە کەسێکی غەوارە لە ئەمەریکا بکا باشترە لەوەی لەگەڵ کابرایەکی جوتیارِی گوندیدا پیر ببێ، لەبەر ئەوەی ژنان لە ئەمەریکا ناچار نین لە کێڵگەکاندا کار بکەن و لەوێندەر برنج و دار بۆ هەمووان هەن. لەوێ بۆ هەر کوێیەک بڕۆیت، پیاوان دەرگەیان کردۆتەوە و کڵاویان بەرز کردۆتەوە و هاوار دەکەن:"یەکەم جار خانمان... فەرموون ئێوە پێش بکەون!"

لە کەشتییەکەدا هەندێکمان لە (کیۆتو) وە هاتبووین، ناسک و سپی و بەژنرێک بووین و بەدرێژاییی ژیانمان لە ژووری تاریک و نووتەکی حەوشی دواوەی ماڵەکاندا ژیابووین. هەندێکمان خەڵکی (نارا) بووین و رۆژی سێ جار نوێژمان کردبوو بۆ باووباپیرانمان و سوێندمان بۆ خواردبوون، کە هێشتا دەتوانین زەنگی ناقوسی پەرستگەکانمان ببیستین. هەندێکمان کچە جووتیارانی خەڵکی یاماگوشی بووین، قۆڵ و مەچەکمان بەهێز و شانمان پان و هەرگیز لە دوای سەعات نۆوە نەچووبووینە نێو جێگە، هەندێکمان لە گوندێکی بچووکی چیا لە (یاماناشی) یەوە هاتبووین و بەو دوایییانە یەکەمین شەمەندەفەری خۆمان بینیبوو. هەندێکمان لە (تۆکیۆ) وە هاتبووین و هەموو شتێکمان بینیبوو، بە ژاپۆنییەکی ڕەوان دەپەیڤین و زۆر هامشۆی ئەوانی ترمان نەدەکرد. زوربەی زۆرمان لە (کاگوشیما) وە هاتبووین و بە شێوەزارێکی قورسی باشووری دەدواین و ئەوانەمان کە خەڵکی تۆکیۆ بووین، وامان دەنواند لە زوبانەکەیان تێناگەین. هەندێکمان خەڵکی هوکایدو بووین، کە ئەوێ شوێنێکی بەفرین و ساردە، ساڵانێکی زۆر دواتر خەونمان بەو سروشتە سپییەی ئەوێوە دەبینی. هەندێکمان لە (هێروشیما) وە هاتبووین کە دواتر بۆردومان کرا،

ئەگەرچی ئەوکات نەماندەزانی، بەڵام بەختمان هەبوو کە لەوێ نەبووین و لە کەشتییەکەدا بووین. گەنجترینمان تەمەنی دوازدە ساڵان بوو، خەڵکی کەناری خۆرهەڵاتی دوورگەی (بیواس) و هێشتا باڵق نەبووبوو. دەیگوت: *دایک و باوکم لەبەر پارەی مارەبییەکە بەشوویان داوم.* بەتەمەنترینمان سیوحەوت ساڵان بوو، خەڵکی (نیگاتا) و هەر هەموو ژیانی بۆ خزمەتی باوکە ئیفلیجەکەی تەرخان کردبوو. تازەکی باوکی مردبوو، ئەو مردنە هەم خۆشحاڵ و هەم غەمگینی کردبوو. دەیگوت: *دەمزانی تا نەمری، ناتوانم شوو بکەم.* یەکێکمان خەڵکی (کیوموتۆ) بوو، کە پیاوی دیار و بەرچاوی لێ نەبوون – هەموو پیاوە دیار و بەرچاوەکانی ئەوێ بەدرێژاییی ساڵان بەدوای ئیشدا سەریان بۆ مانشوریت هەڵگرتبوو – هەستی دەکرد بەختی هەبووە توانیویەتی مێردێک بدۆزێتەوە. گوتی: *تەماشایەکی ڕەسمەکەیم کرد و بە دەلالی هاوسەرگیرییەکەم گوت: "ئەمەیان گونجاوە!"* یەکێکمان خەڵکی گوندێکی ئاوریشمچن بوو لە (فوکوشیما) و مێردی یەکەمی بە ئەنفلۆنزا مردبوو، مێردی دووەمی لێی جیا بووبۆوە و ژنێکی گەنجتر و جوانتری هێنابوو، کە لەوبەری یاڵەکەوە دەژیا، وا ئێستاش بە زەریادا بەرەو ئەمەریکا دەڕۆیشت، تا شوو بە مێردی سێیەمی بکا. دەیگوت: *ئەو لەشی ساخە. ناخواتەوە و قومار ناکا. ئەوە هەموو ئەو شتانە بوون، کە پێویست بوو بیانزانم.* یەکێکمان سەمازانێکی خەڵکی ئوساکا بوو، جوان خۆی دەگۆڕی، دەموچاوێکی سپیوسۆڵی تا ڕادەیەک نازکی هەبوو، هەموو شتێکی لەبارەی پیاوانەوە دەزانی، ئەوە ئەو بوو، کە هەموو شەوێک بە پرسیارەکانمان ڕوومان لێ دەنا. دەمانگوت: چەند دەخایەنێ؟ گڵۆپ داگیرسابێ باشترە یان تاریک بێ؟ لینگمان هەڵبڕیبێ باشترە یان دامانگرتبێ؟ چاومان کراوە بێ یان نووقاو؟ چی ڕوو دەدا ئەگەر هەناسەمان بۆ نەدرێ؟ چی دەبێت ئەگەر کابرا زۆر قورس بێت؟ چی ڕوو دەدا ئەگەر کابرا زۆر زل بێ؟ چی ڕوو دەدا ئەگەر نەیەوێین؟

ئەو دەیگوت: *بەڕاستی هەر زۆر ئاسانە لە پیاو تێبگەن.* وای پێدەگوتین و پاشان ڕوونی دەکردەوە چۆن.

لە کەشتییەکەدا، هەندێ جار چەندین سەعات لە تاریکاییە پرتەپرتکەرە شێدارەکەی بنی کەشتییەکەدا، پڕ لە پەرۆشی و ترس، بەبێداری ڕادەکشاین، بیرمان دەکردەوە: ئاخۆ بڵێی تا سێ هەفتەی تر بەرگە بگرین.

لە کەشتییەکەدا، باوڵی سەفەرمان پێ بوو، کە هەموو ئەو شتانەی لە ژیانە تازەکەماندا پێویستمان پێیان دەبوو، تێ کردبوون: جلکی ئاوریشمین بۆ شەوی بووکێنی، جلکی لۆکەیی ڕەنگاوڕەنگ بۆ ڕۆژ، جلکی لۆکەیی یەکڕەنگ بۆ کاتێک، کە پیر دەبین، فڵچەی خۆشنووسی، قەڵەمی ڕاپیدۆگرافیی ڕەش و ئەستوور، کاغەزی تەنکی برنج، تا نامەی درێژ درێژی بۆماڵەوە تێدا بنووسین، پەیکەری بچووک بچووکی بودا لە مس و زینک و پەیکەری خواوەندی برنج لە ددانی فیل، بووکەشووشەگەلێک، کە لە تەمەنی پێنج ساڵیمانەوە لەلای خۆمانەوە خەواندبوومانن، کیسەگەلی پڕ لە شەکری خاو، کە شتی پێ بکڕین، پەتۆی ڕەنگاوڕەنگ، باوەشێنی کاغەز، مرواریی ئینگلیزی، قایش، بەردی ڕەشی نەرمی ڕووبارەکەی ئەودیو ماڵەکانمان، تاڵێک قژی لوولی کوڕێک، کە جارێک لە جاران دەستمان پێدا هێنا و خۆشمان ویستبوو، بەڵێنمان پێ دابوو نامەی بۆ بنووسین، گەرچی دڵنیاش بووین، کە هەرگیز بۆی نانووسین، ئاوێنەی زیوین، کە لە دایکانمان وەرمان گرتبوون و هێشتا دواوشەیان لە گوێچکەماندا دەزرینگایەوە: *تۆ دەبێ ئەوە بزانیت: ژنان لاوازن، بەڵام دایکان بەهێزن.*

لە کەشتییەکەدا، گلەوگازندەمان لە هەموو شت هەبوو. لە کێچ و لە ئەسپێ و لە بێخەوی. لەو گڤوورە کپە بێ هەدادانەی کە لە ماتۆڕی کەشتییەکەوە دەهات و دزەی دەکردە ناو خەونەکانمانەوە، گلەوگازندەمان

لە بۆگەنی ئاودەستەکان هەبوو - چاڵی گەورە و کراوە، کە ڕێک دەڕژانە ناو زەریا - گلەوگەزندەمان لە بۆدڕیی خۆمان هەبوو، کە وردەوردە زیادی دەکرد و هەست دەکرا ڕۆژ دوای ڕۆژیش تیژتر دەبێ. گلەوگازندەمان هەبوو لە باڵادەستییەکەی (کازوکو)، لە قرخەقرخەکەی (چیۆ)، لە (فیوسایوس)، کە ئەبەدییانە گۆرانییەکەی (تۆپلێکەرسناس)ی لەبەر خۆیەوە دەگوتەوە و هێور هێور دێوانەی دەکردین. گلەوگازندەمان لە تەوقەکانمان هەبوو، کە بەردەوام بزر دەبوون. دەمانگوت: *بڵێی کێ لەناوماندا بیاندزێت؟* گلەوگازندەمان لەو کچانەی کلاسی یەکەم هەبوو، کە کاتێ لەژێر چەترە ئاوریشمییە وەنەوشەییە خۆرگرەکانیانا لە سەرەوە، لەسەر کەشتییەکە بە پیاسە بەلاماندا تێدەپەڕین، قەت بۆ یەک تاقە جاریش سڵاوێکیان لێ نەدەکردین: *چما خۆیان بە چی دەزانن؟* گلەوگازندەمان لە گەرما و لە سەرما، لە بەتانیی خووریی زبر، گلەوگازندەمان لە گلەوگازندەی خۆمان هەبوو. بەڵام لە ڕاستیدا، زوربەی زۆرمان لە ناوەوەڕا زۆر شادمان بووین، چونکە بەو زووانە، لەگەڵ مێردە تازەکانماندا، کە لەو مانگانەی دواییدا چەندین جار نامەیان بۆ نووسیبووین، لە ئەمەریکا بە دیداری یەک دەگەیشتین. ئەوان بۆیان نووسیبووین: *خانوویەکی جوانم کڕیوە. دەتوانیت گوڵەلالە لە باخچەکەیدا بڕوێنیت. نێرگز بڕوێنیت. هەرچیت دەوێ، بیڕوێنیت. من کێڵگەیەکم هەیە. هۆتێلێک بەڕێوە دەبەم. من بەڕێوەبەری بانقێکم. لە ساڵانێکی زۆر لەمەوبەرەوە ژاپۆنم جێ هێشتووە، تا کۆمپانیایەک بۆ خۆم دامەزرێنم و ژیانی خۆم تەگبیر بکەم. من باڵام ١٧٩ سانتیمەترە و گیرۆدەی هیچ نەخۆشییەکی گولی یان درێژخایەن نیم و هیچکەس لە خێزانەکەمدا شێت نییە. من لە ئۆکایاما لەدایک بووم. لە هیۆگۆ. لە میاگی. لە شیزۆکۆ. من لە گوندێکی نزیک گوندەکەی تۆدا گەورە بووم و چەند ساڵێک لەمەوبەر لە بازاڕ تۆم بینیوە. هەرکاتێ توانیم، خێرا پارەت بۆ سەفەرەکە بۆ*

*ڕەوانـە دەکـەم.*

لـە کەشتییەکەدا، فۆتۆی مێردەکانمـان کردبوونـە مەدالیای درێژکۆلـەوە و بـە زنجیرێکی درێژ کردبوومانتە ملمـان. لـە جانتای بچکۆلـەی ئاوریشم، لـە قووتـووی کۆنـی چـا، لـە پاکەتـی سـووری بۆیـە و لـەو زەرفـی نامـە قاوەییـە ئەسـتوورە ئەمریکییانـەدا، کـە لـە سـەرەتادا فۆتۆکانیـان تێدا هەناردبـوون، هەڵمـان گرتبـوون. وێنەکانمـان خسـتبوونە نێوان لاپەڕەکانـی کتێبی ڕێنوێنیی گەشتیاریی *"وەرن، ژاپۆنییەکان"*ەوە، خسـتبوومانتە نێوان لاپـەڕەی کتێبەکانـی ڕێنوێنـی، بـۆ ئەوانـەی سـەفەر بـۆ ئەمەریـکا دەکـەن و کتێبـی *دە شـتیواز، کـە مـرۆڤ حـەز لـە بەرگـە شـیعرە بودایییە کۆن و دراوەکانـی سـوترا بکا*، یەکێکیشـمان، کـە کریسـتیان و گۆشـتی دەخـوارد و نوێـژی بـۆ خودایەکـی قژبـژ دەکـرد، وێنـەی مێردەکـەی لەنێـوان لاپـەڕەی تەوراتەکـەی شـا یاقوبـدا دانابـوو. کاتێـک لێمـان دەپرسـی ئاخـۆ زیاتر کام پیاوەیانـی خۆشـتر دەوێ – پیـاوی نـاو فۆتۆکـە یـان حەزرەتـی مەسـیح خـۆی – ئـەو بـە زەردەخەیەکـی پڕماناوە وەڵامـی دەدایەنـەوە: *"هەڵبـەت، ئـەو!"*

لـە کەشتییەکەدا، زوربـەی زۆرمـان خـاوەن نهێنیگەلێـک بوویـن، کـە سـوێندمان خواردبـوو هەرگیـز بەدرێژاییـی ژیانمـان بـۆ مێردەکانمـان بەرهەڵدایان نەکەیـن. دەشـێ ئـەوە پاسـاوی ڕاسـتەقینە بێت، بـۆ ئـەوەی کە ئێمـە بۆیـە سـەفەرمان بـۆ ئەمەریـکا دەکـرد، تـا شـوێنپێی باوکێکـی بزربـوو هەڵبگریـن، کـە لـە سـالانێکی زۆر لەوەوبـەرەوە جێـی هێشـتبووین. *باوکمـان سـەفەری بـۆ یومینـگ کردبـوو، تـا لـە کانەخەڵوزەکانـا ئیـش بـکا و پاشـان ئیتر لێمـان شـوێنبزر بووبـوو.* یـان دەشـێ کچێکـی بچکۆلەمـان لـەدوای خۆمانـەوە جـێ هێشـتبێ، کـە لـە پیاوێـک بوومانـە، ئێسـتا بەحـاڵ ڕووخسـاریمان بیـر دەهاتـەوە – ڕەنگبـێ لـە حەکایەتخوانێکـی گـەڕۆک بووبێتمـان، کـە هەفتەیـەک لـە گوندەکەمانـدا ماوەتـەوە، یاخـود لـە قەشـەیەکی بودایيمـان بووبـێ، کـە

ئێوارەیەکی درەنگ لە ڕێگەیدا بەرەو چیای فوجی، لە بەردەرگەی ماڵماندا ڕاوەستاوە. تەنانەت ئەگەر دڵنیاش بین کە دایکان و باوکانمان بەباشی ئاگایان لە کچەکەمان دەبێت - ئاخر هەمیشە دەنووکیان لەسەرمان بوو و پێیان دەگوتین - *ئەگەر لێرە، لە گوند بمێننەوە، ئەوا قەت شوو ناکەن* - کەچی هێشتا هەر هەست بە ئازاری ویژدان دەکەین، بەوەی دوای ژیانی خۆمان کەوتین و کچەکانمان بەجێ هێشتن. لە کەشتییەکەدا، هەموو شەوێک بۆیان دەگریاین، بەڵام بەیانییەکیان لەخەو هەستاین، چاومان سڕی و گوتمان: "ئیتر بەسە!" وامان گوت و بیرمان لە شتی تر کردەوە. بیر لەوەی کاتێ پێ دەنێینە کەنار، چ جلکێکمان لەبەردا بێ، قژمان چۆن بێت، کاتێ بۆ یەکەم جار مێردە تازەکانمان دەبینین، چییان پێ بڵێین. لەبەر ئەوەی ئێستا ئێمە لە کەشتیداین، کەواتە ڕابردوومان لەدوای خۆمانەوە جێ هێشتووە و چ ڕێگەیەک بۆ گەڕانەوە نییە.

لە کەشتییەکەدا، ئەوەمان نەدەزانی کە هەتا دەمرین، هەموو شەوێک خەون بە کچەکانمانەوە دەبینین. ئەوان لە خەونەکانماندا هەمیشە تەمەنیان سێساڵان و ڕێک وەک ئەوە دەبن، کە بۆ دوایین جار بینیبوومانن: کچێکی بچووک لە کیمۆنۆیەکی سووری تۆخدا، بە چیچکانەوە لای گۆمێکەوە دانیشتووە و هەر تەواو واقی بە بینینی هەنگێکی مردوو وڕ ماوە.

لە کەشتییەکەدا، هەموو ڕۆژێک هەمان خواردنمان دەخوارد و هەمان هەوای بۆسارەدمان هەڵدەمژت. هەمان گۆرانیمان دەگوت و بە هەمان سوعبەت پێدەکەنین، بەیانیانیش کاتێ هەوا خۆش بوو، لەبنی تەنگی کەشتییەکەوە هەڵدەگژاینە سەرێ و بە سۆڵە تەختەیی و جلکە تەنکە هاوینەییەکانمانەوە، بەسەر کەشتییەکەدا دەگەڕاین و جاروبار ڕادەوەستاین، تا تەماشای زەریای شینی بێکۆتایی بکەین. هەندێ جار تەیرەماسییەک لەبەر پێماندا دەنیشتەوە، هەناسەی لەبەر بڕابوو و خۆی

ڕادەتەکاند و دەمی دادەچەقاند، یەکێکیشمان - بەزۆری کچی یەکێک لە ماسیگرەکان - هەڵی دەگرت و هەڵی دەدایەوە ناو ئاوەکە. یاخود ڕەوە دۆلفینێک لە جێگەیەکەوە وەدیار دەکەوتن و بە سەعات پێبەپێی کەشتییەکە بازیان دەدا. بەیانییەکی ئارام و بێ هەوا، کاتێ زەریا وەک شووشە دەدرەوشایەوە و ئاسمان شینێکی بریقەدار بوو، لەناکاوێکڕا باڵی نەرم و ڕەشی نەهەنگێک لە ئاوەکەوە بەرز بۆوە و پاشان دیار نەما، بۆ ساتێک بیرمان چۆوە هەناسە بدەین. ڕێک دەتگوت *لەنێو چاوانی بودا دەنۆڕین*.

لە کەشتییەکەدا، بەزۆری بە سەعات لە سەرەوە ڕادەوەستاین و لە کاتێکدا سەرنجی موسافیرەکانی تر، کە بەلاماندا تێدەپەڕین، دەدان، با شەپۆلی بە پرچمان دەدا. شێخگەلێکی مێزەربەسەری خەڵکی پنجابمان دەبینین، کە لە وڵاتەکەیان هەڵدەهاتن و بۆ پەناما دەچوون. ڕووسگەلێکی داراماان دەبینین، کە لە شۆڕش هەڵدەهاتن. کرێکارانی چینیی خەڵکی هۆنگ کۆنگمان دەبینین، کە بەڕێوە بوون بچن بۆ پیرۆ، تا ئیش لە کێڵگەکانی پەمووودا بکەن. کینگ لین ئۆڤانۆڤیچ و باندە قەرەجە بەناوبانگەکەیمان بینین، کە کێڵگەیەکی گەورەی ئاژەڵانی لە مەکسیکۆ هەبوو و پروپاگەندەی ئەوەشی بۆ خۆی دەکرد، کە سەرۆکی دەوڵەمەندترین باندی قەرەجانی دونیایە. سیانە گەشتیارێکی بەهەتاوسووتاوی ئەڵمانیاییمان بینین و قەشەیەکی کەشخەی ئیسپانیایی و ئینگلیزێکی سوورکەلە بە ناوی چارلیس، کە هەموو پاشنیوەڕۆیەک، سەعات سێ و چارەک دەهاتە سەر لێواری کەشتییەکە و چەند جارێک بەخێرایی، بەناو کەشتییەکەدا دەهات و دەچوو. چارلیس لە کلاسی یەکەمدا سەفەری دەکرد و خاوەن چاوانێکی سەوزی تۆخ و کەپوویەکی تیژ و بە ژاپۆنییەکی ڕەوان دەپەیڤی، بۆ زوربەی زۆرمان، ئەو یەکەم سپییپێستێک بوو، کە لە ژیانماندا بینیبوومان. چارلیس پرۆفیسۆری زوبانە بیانییەکان بوو لە زانکۆی ئوساکا و ژنێکی ژاپۆنیی

و منداڵێکی هەبوو. ئەو زۆر جار لە ئەمەریکا بووبوو. حەوسەڵەیەکی باشی بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکانمان هەبوو. لێمان دەپرسی: ئایا ڕاستە ئەمەریکاییەکان بۆنێکی ئاژەڵانەی خۆترنجێنیان لێ دێ؟ (چارلیس پێدەکەنی و دەیگوت: چما من وام؟ وای دەگوت و لێدەگەڕا دانەوینەوە و مشەمش بۆنی بکەین.) دەمانپرسی: ئەدی باشە ئەمەریکاییەکان ڕێک چەند تووکنن؟ (چارلیس وەڵامی دەدایەوە: تا ڕادەیەک وەک من تووکنن.) وای دەگوت و پاشان قۆڵی هەڵدەکرد و دەمانبینی قۆڵی بە تووکێکی قاوەیی تۆخ پۆشراوە و ئیدی ئەوە زەندەقی دەبردین. دەمانپرسی: ئاخۆ ئەوان سینگیان تووکی پێوەیە؟ (چارلیس سوور هەڵدەگەڕا و دەیگوت: ناتوانێ سینگیمان پیشان بدا.) ئێمەیش سوور هەڵدەگەڕاین و دەمانگوت، خۆ داوای شتی وامان لێ نەکردوویت. دەمانپرسی، ئاخۆ هێشتا خێڵی درندەی هیندییە سوورەکان لە ئەمەریکا هەن و مێرغوزارەکان لە پێوە دەدەن؟ (چارلیس دەیگێڕایەوە، هەموو هیندییە سوورەکان دوور خراونەتەوە.) وای دەگوت و ئێمەیش هەناسەیەکی ئۆخەیمان هەڵدەمژت. دەمانپرسی، ئاخۆ ڕاستە ژنان لە ئەمەریکا ناچار نین بۆ مێردەکانیان بنووشتێنەوە، یان کاتێ پێدەکەنن، دەست بە دەمیانەوە ناگرن؟ چارلیس تەماشای کەشتییەکی دەکرد، کە لەلای ئاسۆوە تێدەپەڕی، هەناسەیەکی هەڵدەکێشا و دەی گوت: "هەڵبەت بەداخەوە، ئا." دەمانپرسی: ئاخۆ ڕاستە پیاوان و ژنان بەدرێژایی شەوان بەرامبەر یەک سەما دەکەن؟ (چارلیس ڕوونی دەکردەوە: تەنها شەممەوان.) دەمانپرسی: ئەی سەماکە قورسە؟ چارلیس وەڵامی دەدایەوە: "سەماکە سووکە." پاشان شەوی داهاتوو لەسەر کەشتییەکە وانەیەکی لەبەر تریفەی مانگەشەودا لەبارەی سەمای (فوکستروت)ەوە پێ دەگوتین: *خاو، خاو، خێرا، خێرا*. دەمانپرسی: ئایا ڕاستە ناوەندی شاری سان فرانسیسکۆ لە گینزا گەورەترە؟ (چارلیس وەڵامی دەدایەوە: ئا، بێگومان.) دەمانپرسی: ئایا خانووەکان لە ئەمەریکا

سێهێنده لەوانەی خۆمان گەورەترن؟ (چارلیس وەڵامی دەداینەوە: ئا، هەر بەڕاستی بەو جۆرەیە.) دەمانپرسی: ئەی ڕاستە هەرماڵە پیانۆیەک لە هۆڵەکانیاندایە؟ (چارلیس دەیگوت: ڕاستتر ماڵ نا ماڵێک.) دەمانپرسی: ئەی پێت وایە ئێمە بتوانین لەوێ بەختەوەر بین؟ (چارلیس چاویلکەکەی لە چاوی دادەکەند، بە چاوە سەوزە جوانەکانی تەماشای دەکردین و دەیگوت: ئا، هەر زۆر.)

لە کەشتییەکەدا، هەندێکمان نەماندەتوانی نەبینە هاوڕێی زەریاوانەکان، کە خەڵکی هەمان گوندەکانی لای خۆمان بوون و هەموو وشەکانی گۆرانییەکانی ئێمە بەڵەد و بەردەوامیش داوای پەیوەندییان لێ دەکردین. بەڵام ئێمە بۆمان ڕوون دەکردنەوە شوومان کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هێشتا هەر هەندێکمان عاشقیان دەبووین. کاتێکیش داوایان لێ کردین بەتەنها بمانبینن – دەیانگوت ئەمشەو، سەعات دە و چارەک لە ئەرشی ناوەڕاستی کەشتییەکەدا – بۆ ساتێک زەق زەق لە خوارەوە، لە پێوپلی خۆمان دەنۆڕی، هەناسەیەکی قووڵمان هەڵدەکێشا و دەمانگوت: "باشە." ئەوەش شتێک بوو، بەتەما نەبووین هەرگیز بۆ مێردەکانمانی بگێڕینەوە. دواتر ئاوها بیرمان لێ دەکردنەوە: *ئەوە شێوازی خۆی بوو، کە تەماشای پێ دەکردم.* یان: *ئەو خاوەن زەردەخەنەیەکی زۆر جوان بوو.*

یەکێکمان لە کەشتییەکەدا، دووگیان بوو، بەڵام پێی نەزانیبوو، کاتێک نۆ مانگ دواتر منداڵەکەی بوو، یەکەم شتێک کە سەرنجی دا، ئەوە بوو منداڵەکە هەر زۆر لە مێردە تازەکەی دەچوو. پێی گوتبوو: *چاوانی هەر دەڵێی چاوی خۆتن.* یەکێکمان دوای ئەوەی شەوێکی لەگەڵ زەریاوانێکدا بەسەر بردبوو، لە کەشتییەکە خۆی هەڵدایە خوارەوە و پارچەکاغەزێکی لەسەر سەرینەکەی جێ هێشتبوو: *ئیدی دوای ئەو، کەسی تر بوونی نییە.* یەکێکمان عاشقی مژدەبەرێکی کڵێسای میتۆدیستی بوو، کە

بەڕێوە بوو بۆ وڵاتەکەی بگەڕێتەوە و ئەم لەسەر کەشتییەکە ئاشنای بووبوو، ئەگەرچی مژدەبەرەکە دوعای کردبوو، کە ئەمە خوایە کاتێ دەگەنە ئەمەریکا، دەسبەرداری مێردەکەی ببێ، بەڵام ژنەکە بۆی ڕوون کردبووەوە، ناتوانێت وا بکا. پێی گوتبوو: "من دەبێ دوای چارەنووسی خۆم بکەوم." بەڵام بەدرێژایی ئەودوای تەمەنی، بیری لەو ژیانە کردبووەوە، کە دەکرا لەگەڵ ئەو پیاوەدا بەسەری ببات.

لە کەشتییەکەدا، هەندێکمان حەزمان لەوە بوو لە خۆمان ڕابمێنین، لەگەڵ خۆماندا بین و زوربەی کاتی سەفەرەکەمان لە کابینەی خەوەکانماندا لەسەر زگ ڕاکشێین و بیر لە هەموو ئەو پیاوانە بکەینەوە، کە لەدوای خۆمانەوە جێمان هێشتبوون. بیر لە کوڕی ژنە بەقاڵەکە بکەینەوە، کە هەمیشە وای دەنواند نامانبینێ، بەڵام هەرکاتێ دایکی، کە دوکانەکەی بەڕێوە دەبرد، غافڵ دەبوو، نارنجێکی زیادەی دەداینێ. بیرمان لەو پیاوە ژنداره دەکردەوە، کە جارێکیان ئێوارەیەکی درەنگ بۆ ماوەی دوو سەعات لەبەر باران و لەسەر پردێک چاوەڕێیمان کرد، بۆچی؟ بۆ ماچێک و بەڵێنێک. پێی گوتبووین: " سبەینێ دێمەوە." لەگەڵ ئەوەشدا کە قەت جارێکی تر نەماندەبینییەوە، کەچی هەموو ڕۆژێک بەبێ دوودڵی چاوەڕێیمان دەکرد. ئاخر هاودەمیکردنی ئەو بۆ تاقە جارێک بەلامانەوە بە بارتەقای هەر هەموو ژیان بوو. زۆر جاران کاتێ خەریک بوو خەومان لێ دەکەوت، بەسەر خۆماندا دەهاتین بیر لەو کوڕە جووتیارە دەکەینەوە، کە هەموو عەسرانێک کاتێ لە قوتابخانەوە بۆ ماڵەوە دەگەڕاینەوە، قسەمان لەگەڵدا دەکرد – ئەو کوڕە گەنجە قۆزەی ئاوایییەکەی هاوسێمان، کە دەستەکانی ئێغوای سەختترین توویان لە ئەرزدا دەکرد – و هەر وا بیرمان لەوە دەکردەوە، چۆن دایکانمان، کە بە هەموو شتێیان دەزانین و زۆر جار بیر و خەیاڵاتمانیان دەخوێندەوە، بە جۆرێک تەماشایان دەکردین، وەک ئەوەی شێت بووبین. دەیانگوت: چییە،

*دەتانەوێ ئەودوای ژیانتان بە چیچکانەوە لە کێڵگەیەکدا بەسەر ببەن؟* (ئێمە خانەگومان بووین و تا ڕادەیەک بە بەڵێ وەلامَمان دەدانەوە) ئەدی ئێمە هەمیشە خەونمان بەوەوە نەدەبینی، کە وەک دایکمان بین؟ ئایا ئەوە تاقە شتێک نەبوو، کە ئێمە هەر بەڕاستی دەمانویست ببین؟

لە کەشتییەکەدا، دەبوو هەریەکێکمان بڕیاری خۆی بدات، کە لەکوێ بنوێ و پشت بە کێ ببەستێ و ببێتە هاوڕێی کێ و چۆن بشبێتە هاوڕێی. ئەگەر کەسی سەر قەرەوێڵەکەی تەنیشتمان پرخەپرخی کرد یان بەدەم خەوەوە قسەی کرد، یاخود قاچوقوولی لەوەی خۆمان بۆنی ناخۆشتر و جلکە پیسەکانی بەو ناوەدا بڵاو بووبۆوە، چۆن پێی بڵێین. ئەگەر یەکێک لە کچەکان داوای لێ کردین ڕای خۆمان لەبارەی ستایلی قژبڕینەکەیەوە بڵێین - بۆ نموونە ستایلی ئیڤز، ستایلێک، کە وەک ئاگر بە کەشتییەکەدا بڵاو بووبووەوە - ئاخۆ لێی دێ یان نا، بەڵام ئەو خۆی لێی نەدەهات، لەبەر ئەوەی ستایلەکە سەری زۆر گەورە دەر خستووە، ئایا دەبوو ئێمە لەو کاتەدا ڕاستییەکەمان پێ گوتبا، یاخود لەبری ئەوە بمانگوتبا هەرگیز لە ژیانیدا ئەوەندە جوان نەبووە؟ ئایا ئەوە ڕاستە گلەوگازندە لە چێشتلێنەرەکە بکەین، کە خەڵکی چینە و دەزانێ تەنها یەک شێوە خواردن لێبنێ - برنج بە کاری _ کە هەموو ڕۆژێک بۆمان دادەنێ؟ بەڵام ئەگەر شکاتی لێ بکەین و بۆ چین بنێردرێتەوە، ئایا ئەوە گوناهی ئێمە دەبێ، کە بۆ چەند ڕۆژێک هەر هیچ برنجمان نەبێت؟ ئەدی بە هەرحاڵ، چما کەسێک هەیە گوێمان لێ بگرێ؟ ئایا هەر بەڕاستی کەسێک هەیە شکاتەکەمان بەجیدی وەر بگرێت؟

لە جێگەیەکی کەشتییەکەدا، ناخودایەک هەیە و دەڵێن گوایە هەموو بەیانییەک شەبەق کچێکی گەنجی جوان لە ژوورۆکەکەیەوە دێتە دەر. هەڵبەت هەر هەموومان پەرۆشین بزانین، ئاخۆ ئەو کچە یەکێکە لە ئێمە یاخود یەکێک لە کچەکانی کلاسی یەکە؟

لە کەشتییەکەدا، جاروبار شەوانێکی درەنگ دەخزاینە کابینەکانی خەوی یەکترەوە و لەپاڵ یەکدیدا ڕادەکشاین و بەبێدەنگی باسمان لە هەموو ئەو شتانەی لای خۆمان دەکرد، کە بیرمان دەکەوتنەوە: بۆنی خۆشی پەتاتەی شیرینی برژاو لە پاییزانێکی زوودا، سەیران لە جەنگەڵی خەیزەرانەکەدا، باس لەوەی چۆن یاریی تارمایی و شەیتانمان لە حەوشەی پەرستگە داڕووخاوەکەدا دەکرد، باسی ئەو ڕۆژەی کە باوکمان چووە دەرەوە، تا سەتڵێک ئاو لە بیرەکە بهێنێ و ئیدی ببڕای ببڕای نەگەڕایەوە، باسی ئەوەی چۆن دایکمان چیدی بۆ یەک جاریش ناوی باوکمانی نەدەهێنا. *وەک ئەوەی قەت قەت نەبووبێ. من ساڵانێک بەدوای باوکمدا لەبنی ئەو بیرە ورد دەبوومەوە.* وتووێژمان لەبارەی کرێمە لەبەردڵانەکانمانەوە دەکرد، باسی باشییەکانی پۆدرەی کاڵ، باسی یەکەم لەحزە، کە فۆتۆی مێردەکانمان بینین هەستمان بە چی دەکرد. *لە کەسێکی بەئەدەب دەچوو، هات بە خەیاڵماندا، کە شایانمانە.* جاروبار شتی وامان دەگوت، کە پێشتر بە هیچ کەسێکمان نەگوتبوون، کە دەستیشمان پێ دەکرد، ئیتر نەماندەبڕییەوە. جاروبار کتوپڕ بێدەنگ دەبووین و تا بەیانی کازیوە لە باوەشی یەکتردا گرمۆڵە دەبووین، ئەوسا یەکێکمان خۆی لە باوەشی ئەوی تر دەر دەکێشا و دەیپرسی: "بەڵام دەکرێ ئەم بەزمە بەردەوام بێت؟" ئەمەش شتێکی تر بوو، کە دەبوو بڕیاری لێ بدەین. ئەگەر بمانگوتبا: "بەڵێ،" ئەوا بەردەوام دەبووین و ئەگەر شەوی داهاتوو نەهاتینایەتەوە بۆ لای، ئەوا شەوی دوایی، یان دواتر دەهاتینەوە – ئەوسا قەناعەتمان بە خۆمان دەهێنا، کە هەرچی بکەین، هەمان ئەو ساتەوەختەی لە کەشتییەکە دادەبەزین، بیرمان دەچێتەوە. هەڵبەت ئەمەش هەرچۆنێک بێت، پێشەکی و پەراوەیەکی باشە بۆ ئەو کاتەی بە مێردەکانمان دەگەین.

کەمەکێکمان لە کەشتییەکەدا، قەت لەگەڵ پیاوێکدا نەبووبووین، ئەگەر

ڕێگەیەک هەبووایە بەبێ ئەوەی شوو بکەیت سەفەر بۆ ئەمەریکا بکەیت، ئەوا سێودوومان نەدەکرد و دەمانگرتە بەر.

لە کەشتییەکەدا، نەماندەزانی بۆ یەکەم جار چاومان بە مێردەکانمان دەکەوێ، نایانناسینەوە و نازانین کامانەن. نەماندەزانی ئەو کۆمەڵەپیاوەی بە کڵاوی چنراو وَ پاڵتۆی ڕەش و ڕەنگبواردووەوە لە خوارەوە، لە لەنگەرگەکە ڕادەوەستن و چاوەڕێمان دەکەن، هەر هیچ لە پیاوە گەنجە کەشخەکانی ناو فۆتۆکان ناچن. پیاوی ناو وێنەکان تەمەنیان بیست ساڵان بوو. ئەو نامانەی بۆ ئێمە نێردرابوون، لەلایەن پیاوانی ترەوە، جگە لە مێردەکانمان نووسرابوون، پیاوانێکی فێڵبازی دەستخەت - جوان، کە دەزانن چۆن درۆ بهۆننەوە و فریومان بدەن. نەماندەزانی کە بۆ یەکەم جار گوێمان لە ناوی خۆمان دەبێ، کە دەخوێندرێتەوە، یەکێکمان دەست بە چاوانیەوە دەگرێ و دوور دەکەوێتەوە و دەڵێ: من بۆ ماڵەوە دەگەڕێمەوە – لە کاتێکدا ئەوانی ترمان سەر هەڵدەبڕین، جلکەکانمان ڕێک دەخەین، بە ئەسکەلەکەدا دەچینە خوارەوە و پێ دەنێینە ڕۆژێکی هێشتا گەرمەوە. قەناعەت بە خۆمان دێنین: *ئەمە ئەمەریکایە. چ شتێک نییە مایەی نیگەرانیمان بێت.* وا دەڵێین، بەلام هەڵەین.

# یەکەم شەو

ئەو شەوە خێرا مێردەکانمان لەگەڵمان جووت بوون. بەئارامی لەگەڵمان جووت بوون. بە پارێز، بەڵام شێلگیرانە و بەبێ ئەوەی یەک تاقە وشە بڵێن، لەگەڵمان جووت بوون. ئەوان وەک دەڵاڵەکانی هاوسەرگیری بەڵێنیان پێ دابوون، پێیان وا بوو ئێمە پاقیژەین، بۆیە بە دیقەتێکی باشەوە لەگەڵمان جووت بوون. دەیانگوت: *ئەگەر ئێشی هات، پێمان بڵێن.* کاتێ تەخت لەسەر پشت و لەو ئەرزە ساردەی هۆتێلی (مینوتێ)دا ڕاکشاین، لەگەڵمان جووت بوون. لە خوارەوە لە سێنتروم، لە ژوورەکانی کلاسی دووی (کومێنتو ئین)، لە باشترین هۆتێلەکانی سان فرانسیسکۆ، کە ئاسیاییەک بتوانێ پێی تێی بخا، لە هۆتێلەکانی کینو کونییا، میکادو و ئوگاوا لەگەڵمان جووت بوون. ئەوان هاسان وەریان گرتین و پێیان وا بوو هەرچییەکمان پێ بڵێن، دەبێ بۆیان بکەین. گوتیان: *بێ زەحمەت ڕوو بکەنە دیوارەکە و بکەونە سەر چوارپەل.* سووک ئانیشکیان گرتین و بێدەنگ گوتیان: *"ئیتر وەختییەتی!"* بێ ئەوەی ئێمە ئامادە بین، لەگەڵمان جووت بوون و تا سێ ڕۆژ خوێنمان لەبەر دەڕۆیشت. بە جلکە کیمۆنۆ سپییە ئاوریشمییەکانمانەوە، کە لە تەوقی سەرمان ئاڵابوو و لە دڵمان چەسپیبوو، کە دەمرین، لەگەڵمان جووت بوون. یەکێکمان دەیگوت: *من یەک بە خۆم وام زانی دەخنکێم.* چاوچنۆکانە و برسی لەگەڵمان جووت بوون، لەگەڵمان جووت بوون وەک ئەوەی هەزار و یەک ساڵ بێت چاوەڕێ

بن لەگەڵمان جووت ببن. لەگەڵمان جووت بوون ئەگەرچی دوای سەفەری کەشتییەکە هێشتا دڵمان تێکەڵ دەهات و زەوی لەژێر پێماندا دەخولایەوە. هەر کە هەوڵمان دا بەرگری بنوێنین، بە زەبروزەنگ و بە مشتی وێکهاتووەوە لەگەڵمان جووت بوون، لەگەڵمان جووت بوون، ئەگەرچی لێیان پاڕاینەوە، ئەگەرچی پیاماندا کێشان، ئەگەرچی سووکایەتیمان پێ کردن، پێمان گوتن: *ئێوە لە پەنجەتووتەی دایکە قەحبەتان بچووکترن* – وامان پێ گوتن و قیژەیەکی بەرزمان بۆ داوای یارمەتی کرد (کەس بە دەنگمانەوە نەهات). لەگەڵمان جووت بوون، ئەگەرچی لەبەر پێیاندا نووشتابووینەوە و نێوچەوانمان نووساندبوو بە ئەرزەکەوە و سوێندمان دەدان پەلە نەکەن. دەمانگوت: ناکرێ بیخەنە سبەینێ؟ کتوپڕ لەگەڵمان جووت بوون، چونکە هەندێکمان دایکانمان پێیان نەگوتبووین کە پێویستە ڕێک لەو شەوەدا چی بکەین و چی نەکەین. یەکێکمان دەیگوت: من تەمەنم سیازدە ساڵانە و هەرگیز پیاوێکم ڕووبەڕوو نەبینیبوو. لەگەڵ داوای لێبووردن لە دەستە زبر و ڕەقەکانیان، لەگەڵمان جووت بوون و ئیدی ئێمەش یەکسەر بە دەستوپلیاندا زانیمان ئەوانە جووتیارن، نەک پیاوانی بانق. هێمن و ئارام لە دواوە سوارمان بوون، لە کاتێکدا ئێمە بەسەر پەنجەرەکەدا بۆ دەرەوە دانەوییبووینەوە و بە ڕووناکیی شار سەرسام دەبووین. لێیان پرسین: *"ئێستا بەختەوەرن؟"* لە کاتێکدا ئێمە بە دەمدا لەسەر ئەو بەرە شڕانە ڕاکشابووین، کە بۆنی گوومشک و کەڕوویان لێ دەهات، بەستیانینەوە و سوارمان بوون. شێتگیرانە لەسەر سەرچەفە پەڵەپەڵاوییەکان بە پەڵەی زەرد سوارمان بوون. سووکەڵە و بەبێ ج زەحمەتێکی زۆر سوارمان بوون، لەبەرئەوەی هەندێکمان پێشتر چەند جارێک خەڵکی تر سوارمان بووبوون. بە سەرخۆشی سوارمان بوون. توند و بێڕەحمانە و بەبێ سەرنجدان لە ئازارەکەمان، سوارمان بوون. یەکێکمان گوتی: من پێم *وابوو* ڕەحمم دەتەقێ. لەگەڵمان جووت

بوون، ئەگەرچی لاقمان جووت کردبوو و دەپاڕاینەوە: "نەء، تکایە!" بە پارێزەوە لەگەڵمان جووت بوون، وەک ئەوەی بترسن هەڵتلیشێین. یەکێکیان دەیگوت: تۆ زۆر بچووکیت! سارد، بەڵام لێزانانە لەگەڵمان جووت بوون. دەیانگوت: *بیست چرکەی تر هەموو کۆنترۆڵێکی خۆتان لەدەست دەدەن.* وایان دەگوت و ئێمەش زانیمان کە بەر لە ئێمە لەگەڵ زۆر ژنی تردا جووت بوون. لەگەڵمان جووت بوون، لە کاتێکدا ئێمە بەتاڵ و چۆڵوهۆڵ، زەق زەق لە بنمیچەکەمان دەنۆڕی و چاوەڕێ بووین ئەمە تێپەڕێ، بەڵام حاڵی بووین تێناپەڕێ و ساڵانێکی زۆر دەخایەنێ. بە یارمەتیی شاگردی هوتێل و ژنەکانیان لەگەڵمان جووت بوون، توند بە ئەرزەکەوە نووساندیانین تا ڕانەکەین. دەیانگوت: *کاتێک ئەم پیاوە لێدەبێتەوە، ئیدی کەسی تر نایەوێت.* لەگەڵمان جووت بوون، وەک چۆن باوکانمان شەوناشەوێک لە کوختە یەکژووریەکانماندا لە گوند، لەگەڵ دایکانماندا جووت دەبوون: کتوپڕ بەبێ ئاگادارکردنەوە، ڕێک ئەو کاتەی کە خەریک بوو خەومان لێ دەکەوت، لەبەر تیشکی گڵۆپدا لەگەڵمان جووت بوون. لەبەر تریفەی مانگ، لە تاریکیدا کە نەماندەتوانی چ شتێک ببینین، لەگەڵمان جووت بوون. بە شەش چرکە لەگەڵمان جووت بوون و پاشان بە نرکەنرکی لەرزۆکانەوە بەسەرماندا تلیسان و ئێمەش بیرمان لەوە دەکردەوە: هەر بەڕاست، *ئایا ئەوە هەموو شتێک بوو؟* ئەوان گوریان خواردبووەوە و ئێمەش دەمانزانی بۆ ماوەی چەند هەفتەیەک ئازارمان دەبێت. لەگەڵمان جووت بوون، کاتێک لەسەر ئەژنۆ دانیشتبووین، خۆمان نووساندبوو بە کۆڵەکەی تەختەخەوەکەوە و دەگریاین. لەگەڵمان جووت بوون، کاتێ چاومان لە خاڵێکی پڕمانا لەسەر دیوارەکە بڕیبوو، کە تەنها ئەوان دەیانتوانی ببینن. لەگەڵمان جووت بوون، لە کاتێکدا بە ورتەورت و بە شێوەزاری ئاشنای توهوکیی، کە کتوپڕ پێی ئارام دەبووینەوە، دەیانگوت و دەیانگوتەوە: "سوپاس!" یەکێکمان دەیگوت: ئەم

*پیاوه له باوکم دهچێ.* لهگهڵمان جووت بوون، له کاتێکدا به دهنگی بهرز و به شێوهزاری رهقی هێرۆشیمایی، که ئێمه بهحاڵ تێی دهگهیشتین، دهیانقیژاند، ئیدی ئهوکات زانیمان که دهبێ ههموو ئهودوای ژیانمان پێکهوه لهگهڵ ماسیگرێکدا ببهینه سهر. بهپێوه و لهبهر ئاوێنهدا لهگهڵمان جووت بوون و ناچاریان کردین بهدرێژایی کات تهماشای خۆمان له ئاوێنهکهدا بکهین. پێیان دهگوتین: فێر دهبن و *دوایی پێتان خۆش دهبێت.* بهئهدهبانه مهچهکیان گرتین و داوایان لێ کردین نهقیژێنین. به شهرم و زهحمهتێکی زۆرهوه لهگهڵمان جووت بوون، وهک ئهوهی ههوڵ بدهن بهئهدهب بن. دهیانگوت: *بمبووره!* ئینجا دهیانگوت: *ئهمه تۆیت؟ لێرهدا یارمهتیم بده!* ئێمهش به قسهمان دهکردن. به زهبروزهنگهوه لهگهڵمان جووت بوون. به ناڵهناڵهوه، به قیژه و نهعرهتهی درێژهوه. لهگهڵمان جووت بوون، له کاتێکدا خهیاڵیان لای ژنێکی تر بوو. ئێمه ئهوهمان لهو نیگا دوورهی چاوانیاندا دهبینی و پاشان کاتێک هیچ خوێنێکیان لهسهر سهرچهفهکه نهدهبینی، دهکهوتنه بهنهفرهتکردنمان. تهپۆیانه لهگهڵمان جووت بوون و پاشان بۆ ماوهی سێ ساڵ رێگهمان نهدان جارێکی تر دهستیان بهرمان بکهوێ. به ناسکییهکی وهها لهگهڵمان جووت بوون، که ههرگیز له ژیانماندا کهس ئاوها مامهڵهی نهکردبووین، به جۆرێک، که زانیمان تا ههتایه دهمانهوێن. لهگهڵمان جووت بوون، له کاتێکدا له نهشوهدا دهمانقیژاند و پاشان له شهرمدا دهستمان به دهممانهوه دهگرت. بهپهله لهگهڵمان جووت بوون، چهند جارێک لهسهر یهک، ههموو شهوهکه، کاتێکیش بهیانی وهئاگا بووینهوه، ئیدی بووبووینه هی خۆیان.

# سپیپێستەکان

کاتێ ڕوخسەتیان دەدایـن، لـە دەوروبـەری شـارەکانیاندا نیشتەجێ دەبووین، کاتێکیش ڕووخسەتیان نەدەداین – هەندێ جار ئەم ڕستەیەمان لەسـەر تابلۆکانیـان دەخوێنـدەوە: *ئاگادار بن، تەماشـای خـۆر مەکـەن کاتـێ لـەم شـارە ئـاوا دەبـێ* – ئـەوا بـەردەوام دەبوویـن لـە گـەڕان. لـە ئۆردوگای کارێکیانـەوە بـە دۆڵـە تەمومـژاوی و گەرمەکانیانـدا دەچوویـن بـۆ ئۆردووگایەکـی تریـان – سـاکرامێنتو، ئیمپریـال، سـان یواکویـن– و شانبەشـانی مێردە تازەکانمـان زەوییەکانیانمـان دەکێـڵا. شـیلکەکانیانمان لـە واتسونڤیل بۆ لێدەکردنـەوە، ترێکانمانیان لـە فرێسنو و دێنیار بۆ دەڕنین. دەکەوتینـە سـەر چـۆک و لـە دوورگـەی باکون لـە دیلتـا، لـەوێ کـە ئـەرز هەواکێش و نەرمـە، پەتاتەکانیانمـان بـە توێکڵهەڵگری بـاخ بـۆ هەڵدەکەنـدن. لـە ناوچـەی هۆلانـد، لۆبیـا سـەوزەکانیانمان بۆ بژار دەکردن. کاتێکیش کـە وەرزی بەروبووم تـەواو دەبوو، بەتانییەکانمـان لـوول دەکـردن و دەمانـدان بـە کۆڵمانـدا و بـە بوخچـەی جلەکانمـان بـە دەسـتمانەوە ڕادەوەسـتاین و چاوەڕێـی عارەبانەمـان دەکـرد و بـۆ جێگەیەکـی دی دەچوویـن.

ئاو یەکـەم وشـە بـوو، کـە لـە زوبانەکەیانـدا فێری بووین. مێردەکانمـان پێیـان دەگوتیـن: *ئـەو وشـەیە خێرا بـە قیـژە بڵێن، کاتـێ لـە کێڵگەکانـدا هەسـت دەکـەن لەسـەرخۆتان دەچـن. ئەگـەر ئـەم وشـەیە فێر بن، ئـەوا ژیانـی خۆتـان ڕزگار دەکـەن.* زوربەمـان وامـان کـرد، بـەڵام یەکێکمـان، یوشـیکو، کـە دایـەن

لەودیو شوورا بڵندەکانەوە پەروەردەی کردووە و لە هەموو ژیانیدا دەستی بە ئاودا نەکردبوو، خۆی فێری ئەو وشەیە نەکرد. یەکەم ڕۆژ بۆ شەوەکەی، لە (ماربێل ڕانچ) نوستبوو، بەلام چیدی وەئاگا نەهاتبۆوە. مێردەکەی دەیگوت: وام زانی نوستووە. سەرکارەکە ڕوونی کردەوە: گەرما لێی داوە. یەکێکی ترمان لەوە شەرمنتر بوو هاوار بکا، لەبری ئەوە، کەوتبووە سەر ئەژنۆ و لە ئاوەڕۆی جۆگەلەیەکی خواردبۆوە. حەوت ڕۆژ دواتر تیفوس هەڵی قرچاند، لەو وشانەی تر، کە خێرا خۆمان فێر کرد، ئۆکەی بوو. وشەیەک، کە کاتێ سەرکارەکانمان لە ئیشەکانمان قایل دەبوون، پێیان دەگوتین. هەروەها وشەی "بچۆرەوە ماڵەوە،" کە کاتێ زۆر حەپۆل یان خاووخلیچک باین، پێیان دەگوتین.

ماڵەوە چادرە تەختەخەوێک بوو لە یەکێک لە کوختەکانی فیبەر ڕانچ لە یولو. ماڵەوە خێوەتێکی درێژ بوو لەژێر دارهەڵوژەیەکی پرگەڵادا، لە کێڵگەکەی کیتلمان. ماڵەوە کەلەگییەکی تەختە بوو، لە ئەمباری ژمارە ٧، لە ناوچەی بارنهارت لە دەرەوەی لودی. *هیچ شتێک دیار نەبوو، تا چاو بڕکا جگە لە دێراوە پیاز، هیچ دیار نەبوو.* ماڵەوە تەختەخەوێک بوو لە قوڕچۆم لە کادانەکەی جۆن لیماندا، لە نزیک ئەو ئەسپ و مانگایانەی کە بە خەڵات وەری گرتبوون. ماڵەوە قوژبنێکی ژووری جلکشۆرین بوو لە کێڵگەی لەقووتوونانەکەی ستۆکتۆن. ماڵەوە سەکۆیەکی خەوی واگۆنێکی ژەنگاویی شەمەک بوو، لە لومپوک. ماڵەوە بریتی بوو لە کولانەیەکی مریشک لە ویلۆس، کە لەپێش ئێمەدا چینییەکانی لێ ژیابوون. ماڵەوە دۆشەکێکی ئەسپیاوی بوو، لە قوژبنی کوختێکی ئەمبارەکەدا لە دیکسون. ماڵەوە بریتی بوو لە تەختەخەوێک لە کا، بەسەر سێ سندوقەسێوی ژێر دارسێوێکەوە، لە باغی سێوەکەی فرید ستادێلمان. ماڵەوە بریتی بوو لە جێگەیەک لە بینای چۆڵکراوی قوتابخانەیەک لە ماریسڤیل. ماڵەوە بریتی بوو لە پارچەیەک ئەرزی باغێکی هەرمێ لە ئاوبورن، کە دوور نەبوو

لە (ئەمێرکان ڕیڤێر)ەوە، هەموو شەوێک لەوێ بە بێداری ڕادەکشاین و لە ئەستێرە ئەمەریکاییەکانمان دەنۆڕین، کە زۆر جیاوازییان لەگەڵ ئەستێرەکانی خۆماندا نەبوو: لەوێ لای خۆمان، بەژوور سەرمانەوە، ئەستێرەی شوانی مەڕومالات هەبوو، ئەستێرەی کچەچنینکارەکە، ئەستێرەی درەخت و ئەستێرەی ئاومان هەبوون. مێردەکانمان ڕوونیان دەکردەوە: "ئەوە هەمان پلەی پانتاییە". ماڵەوە بریتی بوو لە هەموو ئەو شوێنانەی کە دەغڵودان پێگەییشتبوون و ئامادەی درەوکردن بوون. ماڵەوە بریتی بوو لە هەموو شوێنێک، کە مێردەکانمانی لێ بوون. ماڵەوە لە نزیک پیاوێکەوە بوو، کە ساڵانێک بوو گیاکەڵەی بۆ سەرکارێک بژار دەکرد.

لە سەرەتادا، بەردەوام بیرمان لە ئەمریکاییەکان دەکردەوە. دەمانگوت باشە بۆچی لەبری ئەوەی بەلای ڕاستدا خۆیان هەڵبدەنە سەر ئەسپ، بەلای چەپدا خۆیان هەڵدەدەن؟ ئەرێ ئەوە چۆن یەکتریان بۆ جیا دەکرێتەوە؟ بۆچی بەردەوام دەقیژێنن؟ هەر بەڕاست ئەوان لەبری تابلۆ، دەفر بە دیوارەکانیاندا هەڵدەواسن؟ چما دەرگاکانیان کێلونی هەیە؟ ئەدی پێڵاو لەناو ماڵ لەپێ دەکەن؟ شەوانێکی درەنگ بەر لەوەی بنوون، باسی چ دەکەن؟ خەون بە چییەوە دەبینن؟ کێ دەپەرستن؟ چەند خودایان هەیە؟ ئایا هەر بەڕاستی وایە، پیرەمێردێک لەناو مانگدا دەبینن نەک کەروێشک؟ ڕاستە لە ڕێوڕەسمی مردووناشتندا گۆشتی برژاو دەخۆن؟ شیری مانگا دەخۆنەوە؟ ئەی ئەو بۆگەنەیان چییە؟ مێردەکانمان ڕوونیان دەکردەوە: "ئەوە بۆگەنی کەرەیە."

ئاگادار دەکراینەوە، خۆمانیان لێ بەدوور بگرین. خۆ ئەگەر پێویست بکا لێیان نزیک ببینەوە، ئەوا بە پارێزەوە نزیکیان ببینەوە. هەمیشە باوەڕ نەکەین بەوەی کە دەیڵێن، بەڵام خۆمان فێر بکەین دیقەتیان بدەین: دیقەت لە دەستیان، لە چاویان، لە چاڵی ڕوومەتیان بدەین، لە گۆڕانی

کتوپڕی ڕەنگی ڕووخساریان ورد ببینەوە. زووبەزوو فێر دەبین تێیان بگەین. بەڵام ئاگادار بین زەقزەق لێیان نەنوڕین. لەگەڵ کاتدا، بە قەوارە و قەڵافەتیان ڕادێین. چاوەڕێی خەراپترین بین، بەڵام بە هەندێک چرکەساتی میهرەبانییان تەفرە نەخۆین. میهرەبانی لە هەموو شوێنێک هەیە. لەبیرمان بێ نارەحەتیان نەکەین. فێر بین خۆنەویست بین. بەئەدەب بین. گوێڕایەڵ بین. تەنها بڵێین: "بەڵێ گەورەم،" یان "نا، گەورەم،" و ئەوە بکەین، کە پێمان دەگوترێ. خۆی باشترە هەر هیچ نەڵێین. ئاخر ئێمە ئێستا سەر بە دونیا نەبینراوەکەین.

گاسنەکانی ئەوان لەوانی ئێمە قورستر و بەکارهێنانیان زەحمەتتر بوو، ئەسپەکانیان دوو هێندەی ئەسپەکانی ئێمە لە ژاپۆن دەبوون. ئێمە نەماندەتوانی هەوسارییان بکەین، بەڵکوو دەچووینە سەر سندوقی سێو، یان کورسیلە. کە یەکەم جار قیژاندمان بەسەریانا بجووڵێن، ئەوان تەنها دەیانپرماند و سمەکانیان بە ئەرزەکەدا دەکێشا. لە خۆمان دەپرسی: بڵێی کەڕ بن؟ بڵێی گێل بن؟ یان تەنها لێمان لالووتن. مێردەکانمان بۆیان ڕوون دەکردینەوە: "ئەوانە ئەسپی ئەمەریکایین، لە زوبانی ژاپۆنی تێناگەن! "خۆمان فێری یەکەمین وشەکان لە زوبانی ئەسپەکانیاندا کرد. "گیدیئاپ!" کاتێک دەمانگوت، کە بمانویستایە ئەسپەکە بۆ پێشەوە بڕوات. "باک!" کاتێک بمانویستایە بۆ دواوە بڕوا. "ئیزی!" کاتێک کە بویستراپە خێرایی خۆی خاو بکاتەوە و "وەووو!*" کاتێک دەمانگوت، بمانویستایە ڕاوەستێت. دوای پەنجا ساڵ ژیان لە ئەمەریکا، هێشتا ئەو وشانە تاقە وشەگەلێکی ئینگلیزی بوون، کە بەشێکمان وەک ئاوودۆ ئەزبەرمان بوون.

لە کەشتییەکەدا، لەو کتێبی ڕێنومایی گەشتیارییەوە کە پێمان بوو، خۆمان فێری هەندێ قسەیان کردبوو: "ڕۆژباش،" "ببوورە" و "بێزەحمەت کرێکەمم بدەرێ" دەشمانتوانی خێرا ئەی، بی، سی، دییەکەیان بخوێنینەوە،

---

* وشەگەلێکی ئینگلیزی بۆ جووڵەپێکردنی ئەسپ.

بەڵام لە ئەمەریکا، هەر هیچ ئەو زانیارییانەمان بەکار نەهێنان. نەماندەتوانی گۆڤار یان ڕۆژنامەکانیان بخوێنینەوە. سەرلێشێواوانە لە تابلۆکانیان زەق دەبووینەوە. *تاقە شتێک کە بیرم بوو، ئەو وشەیە بوو کە بە پیتی e دەستی پێ دەکرد.* کاتێکیش سەرکارەکەمان قسەی لەگەڵ دەکردین، بە ڕوون و ئاشکرا قسەکانیمان دەبیست، بەڵام بە گوێمان نامۆ بوو. لەو ساتانەشدا کە پێویست بوو، پێوەندییان لەگەڵدا بگرین. دەمانگوت: میستەر سمیش... – ئەوان ناحاڵی لێمان ورد دەبوونەوە، پاشان شانیان هەڵدەتەکاند و لێیان دەدا و بە ڕێگەی خۆیاندا دەڕۆیشتن.

مێردەکانمان ئامۆژگارییان دەکردین: پێیان خەفەتبار مەبن، دان بە خۆتانا بگرن، ئارام بن، دەیانگوت: *تکایە لێگەڕێن ئێمە شتەکان تەگبیر بکەین.* ئاخر مێردەکانمان زوبانە ئینگلیزییەکەیان دەزانی. دەیانزانی بنیادەم دەبێ لە ئەمەریکا چ بکا. هەموو جارێک کە پێویستمان بە دەرپێیەکی کورتی نوێ دەبوو، مێردەکانمان پێیان لە غروری خۆیان دەنا و بەو کێڵگە هەڵایساوانەدا دەچوون بۆ شار و بە ئینگلیزییەکی پێرفێکت، بەڵام بە ئەکسێنتێکی ڕەقوتەق، داوای دەرپێیەکی نوێیان لە خاوەندوکانەکە بۆ دەکردین. پێیان دەگوت: بۆ خۆمان نا. کاتێکیش دەچووین بۆ کێڵگەیەکی تر و سەرکارەکە سەیرێکی دەکردین و دەیگوت: "هەر زۆر لەڕە! "ئەوە مێردەکانمان بوون، کە بە پێچەوانەکەی قەناعەتیان پێ دەکرد. پێیان دەگوت: ژنەکەم لە کێڵگەکاندا وەک پیاو ئازایە. هەر زۆر زوو ئەو قسەیە بەڕاست دەر دەچوو. کاتێکیش بە هۆی مەلاریاوە لە جێگەدا دەکەوتین و نەماندەتوانی سەر لەسەر ئەرزەکە بەرز بکەینەوە، ئەوە مێردەکانمان بوون کێشەکەیان بۆ سەرکارەکە ڕوون دەکردەوە و دەیانگوت: " یەکەم جار گەرم داهات، پاشان سارد هەڵگەڕا، ئینجا هەمدیس گەرم داهاتەوە." کاتێک سەرکارەکە ئامادەییی دەر دەبڕی بچێت بۆ شار و ئەو دەرمانەمان بۆ بهێنێت کە پێی چاک دەبووینەوە، دەیگوت: "خەمی پارەکەیتان نەبێ."

ئەوە مێردەکانمان بوون کە لەڕادەبەدەر سوپاسگوزاری دەبوون. ئەگەرچی دەرمانەکە بۆ چەند ڕۆژێک میزەکەمانی ڕەش هەڵدەگەڕاند، بەڵام دەستبەجێ هەستمان بە چاکبوونەوە دەکرد.

هەندێکمان خێرا ئیشمان دەکرد، تا سەرسامیان بکەین. هەندێکمان خێرا ئیشمان دەکرد، تەنها بۆ ئەوەی پیشانیان بدەین کە ئێمە لە پیاوەکان خێراتر گوڵ دەچنین و چەوەندەر پاک دەکەین و گونییەکان پڕ دەکەین لە پیاز و سندوقەکان پڕ دەکەین لە میوە. هەندێکمان خێرا ئیشمان دەکرد، لەبەر ئەوەی هەر هەموو تافی منداڵیمان لە مەرەزەکاندا پێپەتی و کووڕ بەسەر بردبوو و دەمانزانی چ دەکەین. هەندێکمان خێرا ئیشمان دەکرد، لەبەر ئەوەی مێردەکانمان ئاگاداریان کردبووینەوە و پێیان گوتبووین ئەگەر خێرا ئیش نەکەین، ئەوا بە یەکەم کەشتی بۆ ژاپۆنمان دەگەڕێننەوە. دەیانگوت: ئێمە *داوای هاوسەری بەهێز و ئازارمان کردووە*. هەندێکمان لە شارەوە هاتبووین و خاوەخاو ئیشمان دەکرد. لەبەر ئەوەی هەرگیز پێشتر پاچمان بە دەستەوە نەگرتبوو، وەک دەمانبیست، "ئەوە ئاسانترین ئیشە لە ئەمەریکا." هەندێکمان بەدرێژاییی ژیانمان لەڕولاواز بووین، بەڵام دوای هەفتەیەک ئیشکردن لە باغەکانی لیمۆ لە ڕیڤێرسید، هەستمان دەکرد لە گا بەهێزترین. یەکێکمان بەر لەوەی یەکەم دێراوی تەواو بکا، دادەڕما و دەکەوت. هەندێکمان ئیشمان دەکرد و دەگریاین. هەندێکمان ئیشمان دەکرد و جنێومان دەدا. هەموومان لە کاتی ئیشکردندا ئازارمان هەبوو — دەستوپلمان بلقی دەکرد و خوێنی لێ دەهات، ئەژنۆمان دەکزایەوە، پشتمان بۆ ڕاست نەدەکرایەوە. یەکێکمان لەلایەن ئەو پیاوە قۆزە هیندۆسییەوە بێزار دەکرا، کە لە کێڵگەکەی ئەو نزیکانەوە کنگرەباریکەی دەڕنی، تاقە شتێک ئەو ژنە دەیتوانی بیری لێ بکاتەوە، ئەوە بوو کە سەرە زلە قاوەییەکەی ئەو پیاوە لە مێزەرە سپییەکەی جیا کاتەوە. دەیگوت: *شەوانە خەون بە کوپتا-سانەوە دەبینم.*

هەندێکمان شیعرە سوترا بودابییەکانمان بەدەم ئیشەوە دەچڕین و دەقیقە لەدوای دەقیقە و سەعات لەدوای سەعات، تێپەڕ دەبوو. یەکێکمان – کە ناوی ئاکیکۆ بوو – لە قوتابخانەی کلێسا لە تۆکیۆ خوێندبووی و ئینگلیزیی دەزانی، هەموو شەوێک بەدەم ئیشەوە و لە تەوراتەوە بە دەنگی بەرز، سروودی "هەستەوە ڕۆحی من، هەستەوە"ی بۆ مێردەکەی دەچڕی. زوربەی زۆرمان هەمان ئەو گۆرانییانەمان بەدەم دروێنەوە دەگوتنەوە، کە لە گەنجیدا گوتبوومانن و هەوڵمان دەدا وا بهێنینە بەرچاومان، کە بۆ ژاپۆن گەڕاوینەتەوە، چونکە ئەگەر مێردەکانمان لە نامەکانیاندا ڕاستییەکەیان پێ بگوتینایە بەوەی ئەوان بازرگانی ئاوریشم نین، بەڵکوو میوەڕنن، لە خانووی گەورەدا بە ژووری زۆرەوە ناژین، بەڵکوو لە خێمە و لەناو کارتۆن و لە دەرەوەش لە کێڵگەکان و لەژێر خۆر و ئەستێرەکاندا دەژین، ئەوا قەت قەت بۆ ئەمەریکا نەدەهاتین تا ئیشێک بکەین، کە هیچ ئەمەریکاییەک ئەگەر ڕێزی خۆی بگرێت، نایکات.

سەریان لە پشتی پتەو و دەستی چوستوچالاکمان سووڕ مابوو. سەریان سووڕ مابوو لە حەوسەڵەمان، لە دیسپلینمان، لە خۆگونجانمان، لە توانای نائاساییمان بۆ بەرگەگرتنی گەرما، کە لە هاویندا لە بێستانەکانی کاڵەکدا لە براولی دەگەیشتە ٤٩ پلەی سەدی. دەیانگوت کورتەبالاییمان وای کردووە هەر زۆر نموونەیی بین بۆ ئیشێک، کە پێویست بکا بنیادەم قووڵ بۆ ئەرز دانەوێتەوە. ئەوان لە هەرشوێنێک دایان بنایینایە، هەر لێمان ڕازی بوون. هەر هەموو سیفەتە باشەکانی چینییەکانمان تێدا بوو – سەخت ئیشمان دەکرد، بەحەوسەڵە بووین، بەوەفا و بەئەدەب بووین – بەڵام سیفەتە خراپەکانی ئەوانمان تێدا نەبوو – قومارمان نەدەکرد، تلیاکمان نەدەکێشا، شەڕمان نەدەکرد و هەرگیز تفمان نەدەکرد. لە فیلیپینییەکان خێراتر بووین و لە هیندۆییەکانیش کەمتر لووتبەرز بووین. لە کۆرییەکان بەدیسپلینتر بووین، لە مەکسیکییەکان

بەئاگاتر بووین. ئێمە خوردوخۆراکمان لە هەر هەموو جووتیاران، لە ئۆکلاهوما و ئارکانساس، بە زەردپێست و ڕەشپێستەکانیانەوە، هەرزانتر دەکەوت. دەیانگوت: *ژاپۆنییەک دەتوانێ ڕۆژی بە کەوچکێک برنج بژێت*. ئێمە باشترین توخمی کرێکار بووین، کە ئەوان بەدرێژاییی ژیانیان بینیبێتیان هاتبێتە ئەمەریکا. دەیانگوت: *ئەم خەڵکەی بەم ناوەدا دێن و دەچن، ئەوانەن کە ئێمە دەمانەوێن، خوا ناردوونی و هەر هیچ پێویست ناکا شوێنی دووریان بەدوادا بگەڕێین.*

بە ڕۆژ لە بێستان و کێڵگەکانیاندا ئیشمان دەکرد، بەڵام هەموو شەوێک کاتێ دەنوستین، لە خەونماندا بۆ ماڵەوە دەگەڕاینەوە. هەندێ جار خەونمان دەبینی، بۆ گوند گەڕاوینەتەوە و بەو چیلکەدارەی کە هەر زۆر حەزمان لێی بوو، تایەیەکی باریکمان بەرەو خوار بە جادەی (فرۆشیارانی دەوڵەمەند)دا، خلۆر دەکردەوە. هەندێ جاری تر، لە خوارەوە لە زەلەکەی نزیک ڕووبارەکەدا، یاریی چاوشارکێمان دەکرد. جاروباریش شتێکمان دەبینی، کە بەلاماندا تێدەپەڕی. ڕۆسیتێکی ئاوریشمینی سوور، کە ساڵانێکی زۆر لەوەوبەر لێمان کەوتبوو. هێلکەیەکی شینی ڕەنگاوڕەنگ، باڵشتە دارینەکەی دایکمان. کیسەڵێک، کە کاتێک تەمەنمان چوار ساڵان بووە، لێما دوور کەوتبۆوە. هەندێ جار پێکەوە لەگەڵ (ئای)ی خوشکە گەورەماندا لەبەر ئاوێنەدا ڕادەوەستاین. ناوی ئەو خوشکەمان واتە (ئەوین) یان (غەم)، لەسەر ئەوە دەوەستێ، کە بنیادەم چۆن وشەکە دەنووسێت، ئەو خوشکەمان قژی بۆ دەکردینە پرچ، دەیگوت: بێجووڵە ڕاوەستن! هەموو شت وەک ئەوە دەبوو، کە دەبوو وا بێ. بەڵام کاتێک بەئاگا دەبووینەوە، خۆمان دەبینی لەتەنیشت پیاوێکی بێگانە و لە وڵاتێکی بێگانە و لە کوختێکی گەرمی تەواو قەپاتی پڕ لە پرخەپرخ و هەناسەی خەڵکانی تردا نوستووین. هەندێ جار ئەو پیاوە بەدەم خەوەوە بە دەستە ڕەق و زبرەکەی بەدواماندا دەگەڕا و ئێمەش هەوڵمان دەدا خۆمانی لێ

دوور بخەینەوە. بە خۆمان دەگوت: *دە ساڵی تر دەبێتە پیرەمێردێک.* هەندێ جار شەبەق لەو ڕووناکییەی کازیوەدا، چاوانی دەکردنەوە و دەیبینی دڵتەنگین، ئەوسا بەڵێنی پێ دەداین کە هەموو شت باشتر دەبێ. ئەگەرچی ئێمە چەند سەعاتێک لەوەوبەر پێمان گوتبوو: "قێزی لێ دەکەینەوە!" کەچی ئەو هەمدیس لە تاریکییەکەدا لەگەڵمان جووت دەبۆوە، لێدەگەڕاین دڵنەواییمان بکا، لەبەر ئەوەی ئەو هەموو شتێکمان بوو. هەندێک جار ڕێک لە چاوانی دەنۆڕین، بەبێ ئەوەی هەر هیچ بمانبینێت، ئەمەش هەمیشە خەراپترین شت بوو. یەکێکمان دەیگوت: *بڵێی کەسێک هەبێ بزانێ من لێرەم؟*

تەواوی هەفتە لە بەرژەوەندیی خۆیان لە کێڵگەکاندا ئیشیان پێ دەکردین، بەڵام یەکشەمموان لێدەگەڕان بحەوێینەوە. لە کاتێکدا مێردەکانمان دەچوون بۆ شار تا لە قومارخانە چینییەکە، کە هەمیشە خاوەنی قومارخانەکە دەیبردەوە، یاریی "فان – تان" بکەن، ئێمە لەژێر درەختەکاندا دادەنیشتین و بە مەرەکەب و فڵچۆکەکانمانەوە و لە کاغەزەبرنجی تەنک و درێژدا، نامەمان بۆ دایکانمان، کە بەڵێنمان پێ دابوون هەرگیز دەستبەرداریان نەبین، دەنووسی. بۆمان دەنووسین: *ئێستا ئێمە لە ئەمەریکاین و گیاکەڵە بۆ ئەو پیاوە گەورەیەی کە پێی دەڵێن سەرکار، بژار دەکەین. لێرە هیچ دارتوویەکی لێ نییە، برە دارحەیزەرانی لێ نییە، پەیکەرگەلی جیزوی لە قەراغی ڕێکەکاندا لێ نییە. تەپۆلکەکان قاوەیی و وشکن و بەدەگمەن باران دەبارێ. چیاکان دوورن، لەبەر چرای نەوتدا دادەنیشین و هەفتەی ڕۆژێک، یەکشەمموان جلەکانمان لە جۆگەکە لەسەر بەردی تەڕ دەشۆین. مێردەکەم پیاوی ناو فۆتۆکە نییە. مێردەکەم پیاوی ناو فۆتۆکەیە، بەڵام زۆر لەو بەتەمەنترە. هاوڕێ کەشخە گیانییەگیانییەکەی مێردەکەم پیاوی ناو فۆتۆکەیە. مێردەکەم بەدمەستە. مێردەکەم بەڕێوەبەری یانەی (یاماتو)یە و تەواوی نێوقەد بەرەو ژووری بە تاتوو پۆشیوە. مێردەکەم*

*لەوە کورتەبالاترە، کە لە نامەکانیدا دەیگوت، بەلام خۆ خۆیشم هەر کورتەبالام. مێردەکەم لەمیانەی جەنگی ڕووسیا و ژاپۆندا، مێدالی پلە شەشی هەژدیهای زێڕینی پێ بەخشراوە و ئێستا پاڵەوانێکە بۆ خۆی. مێردەکەم لە سنووری مەکسیکەوە بە قاچاخ هاتووەتە ئێرە. مێردەکەم سەرنشینێکی خۆڕاییە، کە ڕۆژی بەر لە بوومەلەرزە گەورەکەی ساڵی ۱۹۰٦، لە فرانسیسکۆ بەدزییەوە سوار کەشتی بووە و هەموو شەوێک خەو بەوەوە دەبینێ، کە پێویستە خۆی بگەیەنێتە کەشتییەکە. مێردەکەم دەمپەرستێ. مێردەکەم قەت نامێڵێ بەئیسراحەت دانیشم. مێردەکەم کەسێکی باشە و هەر کە چیدی بڕستی ئیشکردنم نامێنێ، خێرا دەکەوێتە خۆ و لەبەر مـن ئۆڤەر تایم ئیش دەکا، تا سەرکارەکە دەرم نەکا.*

لە دڵی خۆماندا ئاواتمان دەخواست، کەسێک هاتبا و لێیانی ڕزگار کردباین. حەزمان دەکرد ئەو پیاوە بێ، کە لەسەر کەشتییەکە عاشقی بووین. پیاوێک، کە خەڵکی هەمان دوورگەکەی خۆمان و هەمان چیا و هەمان جۆگەلەی لە یادەوەریدا بوو، پیاوێک، کە نەماندەتوانی لە خەیاڵی خۆمانی وەدەر نێین. هەموو ڕۆژێک لە لێواری کەشتییەکەدا لەتەنیشتمانەوە دادەنیشت و باسی ئەوەی بۆ دەکردین، کە ئێمە چەند جوانین، چەند ئاقڵین، چەند تایبەتین. دەیگوت بەدرێژایی ژیانی، قەت قەت جگە لە ئێمە، کەسی تری نەناسیوە. پێی دەگوتین: "چاوەڕێم بکە، هەر هێندەی شتێک پارەم بە دەستەوە بێت، خەڵک دەنێرم بەشوێنتا." دەشێ ئەو پیاوە ئێستا کرێکاری گرێبەند لە کورتیز یان بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی هاوردەکردن هەناردەکردن بێ لە ناوەندی سان جۆیس. هەموو ڕۆژێک، کاتێ بە دەست ئەرزە ڕەشە بە – خۆر - برژاوەکەمان هەڵدەکەند، لە خودا دەپاڕاینەوە کە بەشکم نامەیەکی بکات. بەلام ڕۆژەکان تێدەپەڕین و هیچ نەدەهات. جاروبار شەوانێکی درەنگ، کاتێ خۆمان ئامادە دەکرد بچینە جێگە، کتوپڕ کوڵی گریانمان بەر دەبوو، مێردەکانمان بەنیگەرانی سەرنجیان

دەداین. دەیانپرسی: "بۆ هیچم گوتووە؟" بەڵام ئێمە تەنها سەری نەرێمان رادەوەشاند. بەڵام رۆژێک لە رۆژان هەر بەراستی زەرفی نامەی پیاوی سەر کەشتییەکە بە پۆستدا دەگات. دەنووسێت: *پارەم بۆ مێردەکەت هەناردووە و من لە هۆتێلی تایسبو چاوەرێت دەکەم.* ئیتر ئێمەش ناچار دەبین هەموو شت بۆ مێردەکانمان بگێڕینەوە. ئەگەرچی چەند جارێکی زۆر بە قایشەکانیان لێمان دەدەن و ناووناتۆرەی ناشرینمان دوا دەخەن، بەڵام دواجار دەسبەردارمان دەبن و رێگەمان دەدەن برۆین. ئاخر ئەو پارەیەی کە لە پیاوی سەر کەشتییەکەوە بۆیان هاتووە، چەندقات لەو پارەیە زیاترە، کە مێردەکانمان بۆ ژاپۆنیان ناردووە و ئێمەیان پێ کڕیوە. پێمان دەڵێن: "ئێستا ئیتر بۆی هەیە یەکێکمان بەختەوەر ببێت. "دەڵێ:" هیچ شتێک زۆر ناخایەنێ. "دەڵێ:" یەکەم جار کە چاوم بە چاوت کەوت، دەبوو بمزانیابا ئەو چاوانەی تۆ چاوی قەحبەن."

جاروبار کاتێ ئێمە لە کێڵگەکانیدا دادەنەوینەوە، کابرای سەرکار دەهاتە دوامانەوە و چەند وشەیەکی بە گوێدا دەچرپاندین. ئەگەرچی ئێمە هەر هیچ نەشماندەزانی چ دەڵێ، بەڵام رێک دەمانزانی مەبەستی چییە. وەڵاممان دەدایەوە: "ئێمە ئینگلیزی نازانین." یان دەمانگوت: "ببوورە جەنابی سەرکار، تکایە نا." جاروبار لەلایەن هاوولاتییەکی جوانپۆشەوە پێوەندیمان پێوە دەگیرا، کە لە جێگەیەکەوە دەهات و بانگێشتی دەکردین لەگەڵیدا بۆ شارە گەورەکە بچین و دەیگوت: *"ئەگەر بێیت لەگەڵم و لەلام ئیش بکەیت، ئەوا دەقاتی ئەو کرێیەت دەدەمێ، کە لە کێڵگەکاندا دەتدەنێ.* جاروبار یەکێک لە هاورێ کرێکارە زگورتییەکانی مێردەکانمان، هەر کە مێردەکانمان لەوێ نەدەبوون، لێمان نزیک دەبۆوە، هەوڵی دەدا بەزۆر پێنج دۆلارییەکی کاغەزمان بداتێ و پێی دەگوتین: "لێگەرێ تەنها یەک تاقە جار ئەمەت تێ ببرم. بەڵێن دەدەم کە تەنانەت هەر خۆیشم نەجووڵێنم!" جاروبار ملمان دەدا و دەمانگوت ئێ. پێمان دەگوت: "سبەی

ئێواره سەعات نۆ لەودیو هۆدەی ئەمبارکردنی کاهووەکەوە بە!" یان پێمان دەگوت: "بە پێنج دۆلاری تر بە قسەت دەکەم." دەشێ ئێمە لای مێردەکانمان بەختەوەر نەبووبین، کە هەموو شەوێک بۆ قومارکردن و خواردنەوە دەچوونە دەرەوە و تا درەنگانێکی شەو نەدەگەڕانەوە. یان دەشێ پێویستمان بەوە بووبێت پارە بۆ خێزانەکانمان لە ژاپۆن بنێرینەوە، چونکە هەمدیس لافاو مەرەزەکانیانی وێران کردبوو. بۆیان دەنووسین: *هەموو شتێکمان لەدەست داوە و بە توێکڵی درەخت و بنەگوززوانی کوڵاو دەژین.* هەروەها ئەوانەمان کە جوان نەبوون، زۆر جاران بە مەرامی خەراپ دیارییان دەدرایە: تەوقەیەک لە توێکڵی کیسەڵ، شووشەیەک عەتر، ژمارەیەک گۆڤاری مۆدێرن سکرین، کە لە شار لەسەر کارمەزەلی دوکانێکی هەرزانفرۆشی دزرابوو. بەڵام ئەگەر ئەو دیارییانەمان وەرگرتبان بەبێ ئەوەی هیچ شتێک بەرامبەریان ببەخشین، ئەوا دەمانزانی دەبوو نرخەکەیان بدەین. پیاوەکە سەرپەنجەی یەکێکمانی بە مقەستی ڕووەکبڕینەکەی بڕی. بەو جۆرە خۆمان فێر کردبوو، بەر لەوەی شتێک وەربگرین، باش بیر بکەینەوە و جوان لە چاوی پیاوان بنۆڕین، لەبەر ئەوەی هیچ شتێک لە ئەمەریکا بەخۆڕایی نییە.

هەندێکمان وەک چێشتلێنەر لە ئۆردوگاکانی کاردا ئیشمان دەکرد. هەندێکمان وەک قاپشۆر ئیشمان دەکرد و دەستوپلە ناسکەکانمان دادەوەشاند. هەندێکی ترمان بۆ دۆڵە دوورەکانیان لە ناوچەرگەی گوندەکاندا دەناردین، تا زەمین بەکرێ بگرین و بیچێنین. یاخود مێردەکانمان بیست هەکتار زەوییان لە پیاوێک بە ناوی کالدوێل بەکرێ دەگرت، کە لە ناوچەرگەی بەشی باشووری سان یواکین ڤالی خاوەن هەزاران هەکتار زەوی بوو و هەموو ساڵێک لە سەدا شەستی قازانجەکەمان دەدایێ. ئێمە لە هۆدەیەکدا، کە ئەرزەکەی گڵ و ساپیتەکەی دارەڕا و لە ناوەڕاستی کێڵگەیەکی پانوبەریندا بوو، دەژیاین و لەسەر دۆشەکێک دەنوستین، کە

بە قوڕچوم ئاخنرابوو. لە دەرەوە و لە چاڵێک لە ئەرزەکەدا، دەستمان بە ئاو دەگەیاند. ئاومان لە بیرێکەوە دەهێنا. ڕۆژانە خۆمان بەوەوە خەریک دەکرد، کە لە بەیانییەوە تا ئێوارە تەماتە بچێنین و بیڕنین و بۆ ماوەی چەند هەفتەیەک جگە لە مێردەکانمان، قسەمان لەگەڵ بەشەری خودادا نەدەکرد. پشیلەیەکمان هەبوو، هاودەمیی دەکردین و مشکی ڕاو دەکرد، ئەگەر شەوانە لەبەر دەرگەکەدا ڕاوەستابایین و لە دەرەوە ڕووەو خۆرئاوامان ڕوانیبا، دەمانتوانی ڕۆشناییەکی کز و پرتەپرتکەر لە دوورەوە ببینین. مێردەکانمان دەیانگوت خەڵکێک لەوێ دەژین. ئێمەش دەمانزانی نەدەبوو قەت سەفەرمان کردبا. جا چەندێک بەرز هاواری دایکانمان کردبا، دەمانزانی ئەو ناتوانێ دەنگمان ببیستێ، لەبەر ئەوە هەوڵمان دەدا بەوەی هەمانە، قەناعەت بکەین. وێنەی کیکی ناو ڕۆژنامە هەفتانەکانمان دەبڕین و بە دیوارەکاندا هەڵمان دەواسین. پەردەمان لە گونییەی بێڕەنگی برنج دەدووری. ئەڵتاری بوداییمان لە سندوقی سەروبنی تەماتە دروست دەکرد و بە قوماش دامان دەپۆشی، هەموو بەیانییەک کوپێک چای گەرممان بۆ باووباپیرانمان دادەنا، لە کۆتاییی وەرزی درەویشدا، شازدە کیلۆمەترمان بە پێ بەرەو شار دەبڕی و دیارییەکی بچووکمان بۆ خۆمان دەکڕی: شووشەیەک کۆکاکۆلا، ژێرکراسێکی تازە، سووراوێک کە ڕەنگبێ ڕۆژێک لە ڕۆژان دەرفەتێکمان بۆ بڕەخسێ و لێومانی پێ سوور بکەین. یەکێکمان دەیگوت: ڕەنگە *بۆ کۆنسێرتێک داوەت بکرێم*. هەندێک ساڵ بەروبوومەکە هەر زۆر باش و نرخەکان بەرز و ئێمەش پارەیەکی زیاتر، کە قەت بە خەونیش نەماندەبینی، پەیدا دەکرد. شەش سەد بۆ هەر هیکتارێک. هەندێ ساڵی تر هەموو شتێکمان بە هۆی مێروو یان کەڕوو، یاخود مانگێکی ڕەبەق بەهۆی شەستەبارانەوە لەدەست دەدا، یان بە جۆرێک نرخی تەماتە دادەبەزی، کە ناچار دەبووین هەموو شمەکەکانمان تاڵانفرۆش بکەین، تا بتوانین قەرزەکانمانی پێ بدەینەوە.

بیرمان دەکردەوە ئاخۆ ئێمە بۆ لەوێین. بە مێردەکانمان دەگوت: ئێمە گێل بووین کە بۆ گوند دواتان کەوتین. یان دەمانگوت: تۆ گەنجییت بەهەدەر دام. بەڵام کاتێک لێیان دەپرسین ئاخۆ حەز دەکەین وەک کارەکەری ماڵان لە شار ئیش بکەین، کە هەر دەم پان بکەینەوە و بچەمێینەوە و بەدرێژاییی ڕۆژ جگە لە بەڵێ خانم، بەڵێ خانم، هیچی تر نەڵێین، ناچار دەبووین بڵێین نەء، حەز ناکەین.

پێیان خۆش نەبوو لە دۆڵەکانیاندا ببینە دراوسێیان. پێیان خۆش نەبوو ببینە هاوڕێیان. ئێمە لە کوختی ناشرینیدا دەژیاین و نەماندەتوانی بە ئینگلیزییەکی باش قسە بکەین. ئێمە تەنها خەمی پارەمان بوو، چۆنایەتی میتۆدی کشتوکاڵکردنمان نزم بوو. ئاوی زۆرمان بەکار دەهێنا. زەوییەکانمان وەک پێویست قووڵ نەدەکێلان. مێردەکانمان وەک کۆیلە دەیانچەوساندینەوە. دەگوترا: *ئەوانە ئەو کچانەیان لە ژاپۆنەوە، وەک هێزی خۆراییی ئیش هاوردە کردوون.* ئێمە بەدرێژاییی ڕۆژەکان و بەبێ پشووی نانخواردن، لە کێڵگەکاندا ئیشمان دەکرد. ئێوارانێکی درەنگ لەبەر تیشکی چرا نەوتییەکانماندا ئیشمان دەکرد. یەک تاقە ڕۆژ پشوومان نەبوو. کاتژمێر و تەختەخەو دوو شتن کە هیچ جووتیارێکی ژاپۆنی هەرگیز بەدرێژاییی ژیانی ئیشی پێیان نەبووە، خەریک بوو پیشەسازیی کەلەرمەکەیانمان دەخستە ژێر ڕکێفی خۆمانەوە. پیشەسازیی سپیناخەکەیانمان دەخستە ژێر ڕکێفی خۆمانەوە. پشکمان لە پیشەسازیی شیلکەکایاندا هەبوو، بازاڕی لۆبیاکەیانمان کڕیبوو. ئێمە مەکینەیەکی بێ هەدادان و بێسنوور بووین، کە ئەگەر شاڵاوەکەمان کۆنترۆڵ نەکرابا، ئەوا زووبەزوو هەموو ڕۆژئاوای یو ئێس ئەی دەبووە کۆلۆنی و مەرزێکی تری سنووریی ئاسیاییی ئێمە.

زۆر شەوان چاوەڕێمان دەکردن. جاروبار بە ترومبێل بەلای کوختەکانماندا تێدەپەڕین و پەنجەرەکانمانیان ساچمەباران دەکرد، یان

ئاگریان لە کولانەی مریشکەکانمان بەر دەدا. هەندێ جار هۆدەی زەخیرەکانمانیان بە دینامیت دەتەقاندنەوە. هەندێ جار لە کاتێکدا بەروبوومەکە سەوز دەبوو، دەغڵەکانمانیان دەسووتاندین، بە جۆرێک، کە هەموو داهاتی ئەو ساڵەمان دەچوو بە با. ئەگەرچی بۆ سبەینێ جێگەپێمان لە ئەرزەکەدا دەبینی، بە هەمان شێوە دەنکەشقارتە لەو ناوەدا کەوتبوو، کاتێک بە پۆلیسمان دەگوت بێن و تەماشا بکەن، دەیانگوت ئەو نیشانانە شتێک نین بەدواداچوونیان بۆ بکرێت. ئیدی دوای ئەو رووداوانە، مێردەکانمان هەرگیز وەک خۆیان نەمان. دەیانگوت: *جا ئیتر بنیادەم بۆچی خۆی ماندوو بکا؟* شەوانە بە پێڵاوەوە دەنوستین و تەورداسەکانمان لەتەنیشت تەختەخەوەکانمانەوە دادەنان، هاوکاتیش مێردەکانمان تا رۆژ دەبۆوە، لەبەر پەنجەرەکاندا ئێشکیان دەگرت. جاروبار بە دەنگێک رادەچڵەکاین و خەبەرمان دەبۆوە، بەڵام هیچ نەبوو – دەمانگوت دەشێ لە جێگەیەک لەم جیهانەدا قۆخێک لە درەختێک بووبێتەوە – جاروباریش بەدرێژاییی شەو، بەبێ بچڕان خەو دەیبردینەوە و کاتێ بەیانی وەئاگا دەبووینەوە، مێردەکانمان دەبینی پرخەپرخ لەسەر کورسییەکانیان دەتلیسان، هەوڵمان دەدا بە پارێزەوە خەبەریان بکەینەوە، چونکە تفەنگەکانیان هێشتا لەسەر ئەژنۆیان بوو. هەندێ جار مێردەکانمان سەگی پاسەوانییان دەکڕین و ناویان دەنان دیک یان هاڕی یاخود سپوت، ئیدی زیاتر لە ئێمە بەو سەگانەوە هۆگر دەبوون. ئێمەش بیرمان دەکردەوە، ئاخۆ دەبێ چەند هەڵە بووبین کە ملمان بۆ هاتن بۆ وڵاتێکی ئەوەندە توندوتیژ و دژەمیوان داوە. دەمانگوت: *بڵێی چ میللەتێکی تر هەبێ لە ئەمەریکاییەکان بەربەریتر؟*

یەکێکمان هەمیشە گلەوگازندەی لەوان دەکرد و ئاواتی بە مردنیان دەخواست. یەکێکمان گلەوگازندەی لێ دەکردن و مردنی خۆی بە ئاوات دەخواست. هەندێکی ترمان وا خۆمان ڕاهێنابوو، کە بژین بەبێ ئەوەی

هەر هیچ بیریشیان لێ بکەینەوە. خۆمان هاویشتبووە ناو ئیشەکانمانەوە و خواخوامان بوو گیاکەڵەیەک زیاتر دەر کێشین. ئاوێنەکانمان وەلا نابوون. چیتر قژمان دانەدەهێنا. چیدی سووراووسپیاومان نەدەکرد. یەکێکمان دەیگوت: کاتێ پۆدرە دەدەم لە کەپووم، دەڵێی زوقمە بە چیایەکەوە. بودامان لەبیر خۆمان بردبووەوە. خودامان لەبیری خۆمان بردبووەوە. بەستەڵەکێکمان لە ناوەوەمانڕا دروست دەکرد کە تا ئێستا نەتواوەتەوە. یەکێکمان دەیگوت: *دەترسم ڕۆحم مردبێ.* چیدی نامەمان بۆ دایکانمان نەدەنووسین. کێشمان دابەزیو و لەڕولاواز بووبووین. چیدی بێ نوێژ نەدەبووین. چیدی خەونمان نەدەبینی. چیدی بیری کەس و بیری هیچمان نەدەکرد، تەنها ئیشمان دەکرد، ئەوە هەموو شتێک بوو. ڕۆژی سێ جار خواردنمان دەقڵپاندە خۆمانەوە، بەبێ ئەوەی یەک تاقە وشە لەگەڵ مێردەکانماندا بڵێین، تا بتوانین هەرچی زووترە پەلە بکەین و بۆ کێڵگەکان بگەڕێینەوە. مەن *بۆ خۆم نەمدەتوانی ئەو خایلەیە لە سەرم دەر بکەم، کە دەقیقەیەک زووتر، واتە هەڵکەندنی گیاکەڵەیەک زیاتر.* هەموو شەوێک لنگمان بۆ مێردەکانمان دادەچەقاند، کە هێند شەکەت بووین، زۆر جاران بەر لەوەی ئەوان ئیشی خۆیان تەواو بکەن، ئێمە خەو بردبووینەوە. هەفتەی جارێک جلەکانیانمان لە حەوزی جلکشتندا بە ئاوی لەکوڵ دەشت. چێشتمان بۆ لێدەنان. گسکمان بۆ دەدان. یارمەتیمان لە داربڕیندا دەدان. بەڵام ئەوە ئێمە نەبووین کە چێشتمان لێدەنا و گسکمان دەدا و دارمان دەبڕی، بەڵکوو کەسێکی تر بوو. زۆر جاران مێردەکانمان هەر هیچ سەرنجی ئەوەیان نەدەدا، کە ئێمە دیار نەماوین.

هەندێکمان لە گوندەوە بۆ پەراوێزی شارەکان گواستبوومانەوە و تەواو بەو جێگەیانە ئاشنا بووبووین. لە خانووی کارمەندان لە ئاپارتمانی گەورەدا، لە ئاسێرتون و بێرکلی. لە سەروو تێلیگراف، لەسەر چیاکە دەژیاین. یان بۆ پیاوێکی وەک جیوردانو ئیشمان دەکرد، کە نەشتەرگەرێکی

بەنێوبانگی قەفەسەی سینگ بوو لە (گولدکوستی ئالامیدا). لە کاتێکدا مێردەکانمان چیمەنەکەی دوکتۆر جیوردانویان دەبڕی و تەلانەکانی دوکتۆر جیوردانویان ڕێک دەکرد و گەلاکانی دوکتۆر جیوردانویان دەڕنی، ئێمە لە ماڵەوە لەلای خاتوو جیوردانو بووین، کە قژێکی قاوەیی شەپۆلداری پێوە و خۆیشی کەسێکی میهرەبان و داوای لێ دەکردین بە ڕۆسێ بانگی بکەین. ئێمەش زیوەکانی (ڕۆسێ)مان پۆلیش دەکردن و ئەرزەکەی ڕۆسێمان گسک دەدا و ئاگامان لە سێ منداڵەکەی ڕۆسێ: ریچارد، جیم و سیۆ دەبوو. هەموو ئێوارەیەک، بە زوبانێکی جیاواز لە زوبانەکەی خۆمان لایلایەمان بۆ دەکردن: *نێموری... نێموری*. ئێمە قەت ئەوەمان لە خۆمان ڕانەدەبینی. من کەوتمە *ئەوەی ڕێک وەک منداڵی خۆم ئاگام لەو کوڕانە بێت*. بەڵام ئەوە لوسیا، دایکە پیرەکەی د. جیوردانۆ بوو، کە زیاتر ئاگامان لێی دەبوو. لوسیا تەنانەت لە ئێمەش تەنیاتر بوو، تا ڕادەیەک وەک ئێمەش کورتەبالا بوو، کاتێکیش ترسی لێمان شکا، ئیدی دەستبەردارمان نەدەبوو، کاتێک شتمان دەتەکاند و زەویمان دەسڕی، لەم ژوورەوە بۆ ئەو ژوور دوامان دەکەوت و ڕیزڕیز قسانی دەکرد. *Molto bene, Perfetto! Basta cosi.* سالانێکی زۆر دوای مردنی، یادەوەریی ئەو بۆ وڵاتە کۆنەکەی، وەک ئەوەی یادەوەریی خۆمان بێت، لە زەینماندا مابووەوە: *موزێرالا، پومودوری، لاگو دی کومو، پیازان* لە ناوەڕاستی شار، کە هەموو ڕۆژێک دەڕۆیشت و لەگەڵ خوشکەکانیدا بازاڕی دەکرد. دەیگوت: *ئیتالیا، ئیتالیا، ئای چەندە تامەزرۆم بۆ دوایین جار بتبینمەوە.*

ئەوە ژنەکانی ئەوان بوون فێری ئەو شتانەیان کردین، کە بۆ ئێمەمانان گرینگترین شت بوون بیانزانین: چۆن سۆپایەک دادەگیرسێندرێ. چۆن جێگەیەکی نوستن ڕادەخرێ. چۆن دەرگایەک دەکرێتەوە، کاتێ زەنگ لێی نەدابێ. چۆن تەوقە دەکرێ. چۆن بەلوعەیەکی ئاو، شتۆکەیەک، کە زوربەمان بەدرێژاییی ژیانمان نەمانبینیبێ، بەکار دێنێ. چۆن

ژمارەی تەلەفونێک لێدەدرێ. چۆن لە تەلەفۆندا، لە کاتێکدا کە تووڕە و غەمگینیشین، خۆمان شادمان پیشان دەدەین. چۆن هێلکەوڕۆنێک دەکەین. چۆن پەتاتەیەک پاک دەکەین. چۆن سفرەیەک ڕادەخەین. چۆن بە شەش سەعات، پێنج جۆر چێشتی ژەمی فراڤین بۆ دوازدە کەس لێدەنێین. چۆن جگەرەیەک دادەگیرسێنین. چۆن بازنە بە دووکەڵی جگەرە دەکەین. چۆن قژمان لوول دەکەین، بە جۆرێک، کە ڕێک لە قژی ماری پیکفورد بچێت. چۆن پەڵەی سووراوێک لەسەر کراسە سپییە لەبەردڵانەکەی مێردەکەمان لا دەبەین، ئەگەرچییش سووراوەکە هی ژنێکی ترە. چۆن لەسەر جادە تەنوورەکەمان هەڵدەکەین، بە جۆرێک، کە بە شێوەیەکی زۆر گونجاو ڕووت، قوولەپێمان دەر بخەین. *مەبەستەکە تەنها سەرنجڕاکێشانە، نەک ورووژاندن.* چۆن لەگەڵ مێردێکدا قسان دەکەین. چۆن لەگەڵ مێردێکدا شەڕ دەکەین. چۆن مێردێک فریو دەدەین. چۆن هەڵسوکەوت دەکەین، تا بەر بە مێردەکەمان بگرین، کە ئێجگار زۆر خۆیمان لێ دوور نەخاتەوە. *لێی مەپرسە لەکوێ بووە یان کەی بۆ ماڵەوە دێتەوە و سەرنج بدە ئاخۆ وەزعی لە جێگەی نوستندا باشە.*

ئێمە خۆشمان دەویستن. ئێمە ڕقمان لێیان دەبۆوە. حەزمان دەکرد وەک ئەوان بین. ئەوان زۆر کەڵەگەت بوون، زۆر جوان بوون، پێستیان زۆر سووروسپی. پەلوپۆی درێژ و بەعیشوەیان، ددانی بەدرەوشەی سپییان، ڕووخساری بێڕەنگ و پرشنگداریان، کە هەرحەوت خەوشەکەی جوانیی ڕووخساریانی حەشار دابوو، ڕەفتاری سەیر، بەلام بزوێنەریان، کە قەت لە کەیفخۆشکردنمان نەدەکەوتن، خۆشحاڵییان بە ئەی وەن سۆس و پیلاوی پاژنەبەرزی نووکباریک، شێوازی ئارەزوومەندیان بۆ ڕۆیشتن لەسەر قامکی پێ، حەز و خۆشەویستییان بۆ کۆبوونەوە لە سالۆنەکانی یەکتردا و بە گرووپی پڕ لە دەنگەدەنگەوە و هەر هەموو بەیەکەوە بۆ ماوەی چەند سەعاتێک قسەکردن. بیرمان دەکردەوە ئاخۆ

بۆچی قەت بەسەریاندا نایەت دانیشن؟ پێدەچوو جیهان بە ماڵی خۆیان بزانن. پێدەچوو زۆر دڵنیا بن. ئەوان خاوەن متمانەبەخۆبوونێک بوون، کە ئێمە نەمانبوو. ئەوان خاوەن قژێکی باشتریش بوون. خاوەن ڕەنگی زۆر زۆر. ئەفسووسمان دەخوارد، کە ناتوانین زیاتر لەوان بچین.

وا ڕاهاتبووین شەوانێکی درەنگ لە ژووره تەنگەبەر و بێ پەنجەرەکانمان، لە حەوشەی دواوەی خانووە گەورە و بەهەیبەتەکانیاندا لاساییان بکەینەوە. بە مێردەکانمان دەگوت: تۆ ببەرە جەناب و من دەوری خانم دەبینم. هەندێ جار وەلامیان دەدایەوە: "ئێستا تۆ جەناب بە و من دەبمە خانم." هەوڵمان دەدا ئەوە بەرجەستە بکەین، کە ئەوان چ دەکەن و چ دەڵێن. کێ لە سەری سەرەوەیە، کێ لە خواری خوارەوەیە. ئاخۆ جەناب بەرز دەقیژێنێ؟ ئەی خانم دەقیژێنێ؟ ئاخۆ بەیانیان بە پەلوپۆی پێچخواردووەوە لەخەو هەڵدەسن؟ جاری تر بێجووڵە لە تاریکیدا ڕادەکشاین و باسی ئەوەمان بۆ یەکتری دەکرد، کە ڕۆژەکەمان چۆن بەسەر بردووە. *من فەرشەکانم تەکاند. من بەرگەدۆشەکەکانم کولاند. من گیاکەلە نەفرەتییەکەی بەشی خوارەوەی چیمەنەکەم بە چەقۆی باخەکەم هەڵکەند.* کە تەواو دەبووین، بەتانییەکانمان بەسەر خۆماندا ڕادەکێشان و چاوانمان لێک دەنان و خەونمان بە ڕۆژانێکی باشترەوە دەبینین. خەونمان دەبینی، کە خاوەنخانوویەکی جوان و سپیین لە جادەیەکی درێژی سایەداردا، بە باخچەیەکەوە، کە هەمیشە نوقمی گوڵە. بانیۆیەک، کە تەنها بەچەند دەقیقەیەک پڕ دەبێت لە ئاوی گەرم. خزمەتکارێک، کە هەموو بەیانییەک بەرچاییمان لەسەر سینییەکی خڕی زیو بۆ دێنێ و بە دەست هەموو ژوورەکانی گسک دەدا. کارەکەرێک. جلکشۆرێک. خزمەتکارێکی چینیی لە پاڵتۆیەکی سپیی درێژدا، کە هەر لە زەنگ بدەین، خێرا پەیدا دەبێ و فەرمانی پێ دەدەین: "چارلی، بێزەحمەت چایەکەمم بۆ بهێنە ژوورەوە!"

ئەوان ناوی نوێیان لێ دەناین. بە هێلین و لیلی بانگیان دەکردین. بە مارگەرێت بانگیان دەکردین. بە پیارل بانگیان دەکردین. سەیریان لە جەستەی بچووک و قژی درێژ و بریقەدار و ڕەشمان دەهات. ستایشیان دەکردین، کە ئەوەندە خۆمان لە ئیشدا دەڕەتاند. دەیانگوت: خۆ ئەو کچە تا ئیشەکە تەواو نەکا، دەست هەڵناگرێت. لە بەرچاوی هاوسێکانیاندا خۆیان پێوە هەڵدەکێشاین. لە بەردەم هاوڕێکانیاندا، خۆیان پێمانەوە با دەدا. لافی ئەوەیان لێدەدا، کە زۆر باشتر لەوانی تر خۆشیان دەوێین. دەیانگوت: بنیادەم ئیتر یارمەتیی لەوە باشتر بە چاو نابینێ. کاتێ غەمبار دەبوون و کەس نەبوو قسانیان لەگەڵدا بکا، ئەوا ئەوان قووڵترین و تاریکترین نهێنیی خۆیان لەلا بەرهەڵدا دەکردین. دەیانگوت: هەموو ئەوەی بە مێردەکەم گوتووە، درۆیە. کاتێ مێردەکانیان بە ئیش سەفەریان دەکرد، داوایان لە ئێمە دەکرد کە نەبا ژنەکانیان هەست بە تەنیایی بکەن، لە ژووری نووستنەکەیان بنوین. کاتێ لە نیوەشەودا بانگیان دەکردین، بەدەنگیانەوە دەچووین و تا بەیانی لەوێ لەلایان ڕادەکشاین. پێمان دەگوتن: "ئێ. ئێ. " و " بەقوربان، مەگری!" کاتێ جگە لە مێردەکانیان، عاشقی پیاوێکی تر دەبوون و لە نیوەڕۆدا دەچوون بیانبینن، ئێمە ئاگامان لە منداڵەکانیان دەبوو. لێیان دەپرسین: "ئەرێ جوان وەپێش چاو دێم؟ "یان:" ئەرێ تەنوورەکەم زۆر تەسک نییە؟" گەردی نەبینراوی تۆزمان لە بلوسەکانیان دەسڕی. شاڵەکانیانمان بۆ گرێ دەدان. یاخیترین بسکی لوولیانمان بۆ ڕێک دەکردنەوە، تا باش وەپێش چاو بێ. بەبێ چ قسەیەک تاڵی سپیی پرچیانمان بژار دەکردن. پێمان دەگوتن: "خانم، جوانن!" وامان دەگوت و پاشان بەڕێمان دەکردن. کاتێ مێردەکانیان لە کاتە ئاساییەکەی شەواندا بۆ ماڵەوە دەگەڕانەوە، ئێمە وا خۆمان دەنواند، هیچ شتێک نازانین.

یەکێکیان بەتەنیا لە ماڵێکی داڕووخاوی کارمەندانی باڵا لە سەرەوە، لە نوب هیللی سان فرانسیسکۆ دەژیا و دوازدە ساڵ بوو پێی لە ماڵ

نەبردبووە دەرەوە. یەکێکیان کۆنتێسەیەکی خەڵکی درەیسدن بوو، کە قەت لە ژیانیدا شتێکی بەرز نەکردبووەوە، کە لە چەتاڵ قورستر بووبێت. یەکێکیان لە چنگی بولشەویکەکان لە ڕووسیا هەڵاتبوو و هەموو شەوێک خەونی دەبینی گەڕاوەتەوە ماڵی باوکی لە ئودێسا. دەیگوت: *ئێمە هەموو شتێکمان لەدەست دا.* یەکێکیان بەر لە ئێمە تەنها ئیشی بە ڕەشپێستەکان کردبوو. یەکێکیان بەختی لەگەڵ چینییەکاندا نەبووبوو. دەیگوت: *بنیادەم دەبێ بەردەوام چاوێکی لەسەریان بێت.* یەکێکیان کاتێ ئەرزەکەمان بۆ دەسڕی، ناچاری دەکردین لەبری ئەوەی ئەردسڕ بەکار بهێنین، لەسەر هەرچوار پەل بۆی بسڕین. یەکێکیان پەڕۆکۆنێکی بە دەستەوە دەگرت و هەوڵی دەدا یارمەتیمان بدا، بەڵام ئیشەکەی لێ تێک دەداین. یەکێکیان فراڤینی بەتامی لە دەفری فەخفوری جوانداا بۆ دادەناین و گەرچی ئێمە پەرۆش بووین لەسەر ئیشەکەمان بەردەوام بین، کەچی ئەو هەوڵی دەدا لەسەر مێزەکە لەگەڵی دانیشین. یەکێکیان تا نیوەڕۆ جلکی شەوی نەدەگۆڕی. زوربەیان ژانەسەریان لەگەڵدا بوو. زوربەیان غەمگین بوون. زۆریان دەیانخواردەوە. یەکێکیان هەموو پاشنیوەڕۆیەکی ڕۆژانی هەینی دەیبردین بۆ بازاڕی سیتی ئۆف پاریس لە ناوەندی شار و پێی دەگوتین پارچەیەک جلکی نوێ بۆ خۆمان هەڵگرین. دەیگوت: *حەزتان لە کامەیە؟* یەکێکیان فەرهەنگێک و دوو دەسەسڕی ئاوریشمی دەداینێ و لە یەکەمین کۆرسی فێربوونی ئینگلیزیدا ناونووسی دەکردین. دەیگوت: *شۆفێرەکەم لە خوارەوە چاوەڕێت دەکا.* ئەوانی تریان هەوڵیان دەدا خۆیان ئینگلیزیمان فێر بکەن: *ئەمە یەک سەتڵ. ئەمە یەک زەویسڕ. ئەمە یەک کسک.* یەکێکیان قەت ناوەکانمانی بیر نەدەکەوتنەوە. یەکێکیان هەموو بەیانییەک لە موبەقەکە هاوڕێیانە سڵاوی لێ دەکردین، بەڵام کاتێ لەسەر جادە بەلاماندا تێدەپەڕی، هەر وەک نەماننناسێ وەها بوو، یەکێکیان لە ماوەی ئەو سیازدە ساڵەدا کە ئیشمان بۆ دەکرد، بە هەزار حاڵ یەک تاقە وشە

قسەی لەگەڵدا کردبووین، بەڵام کاتێ مرد، سەروەتێکی بە میرات بۆ جێ هێشتین.

زیاتر حەزمان لەوە بوو، کە ئەوان لە ساڵۆن یان لە فراڤینکردن لە یانە دەبوون و مێردەکانیان هێشتا لە دایرە و منداڵەکانیان هێشتا لە قوتابخانە بۆماڵەوە نەگەڕابوونەوە. ئەوە کاتێک بوو، کە کەس چاوی لە سەرمان نەبوو. کەس قسەی لەگەڵ نەدەکردین، کەس. کاتێ ئێمە مۆبلەکانیانمان دەسڕین، بە دزەدز لەدوامانەوە نەدەهاتن تا بزانن ئاخۆ پەڵەیەکمان بەسەردا تێنەپەڕیوە. هەموو ماڵەکە چۆڵ، بێدەنگ و خۆمانە بوو. پەردەکانمان هەڵدەدانەوە، پەنجەرەکانمان دەکردنەوە، لە کاتێکدا کە بە ژوورەکاندا دەڕۆیشتین و تۆزی سەر شتەکانیانمان دەتاکاند و دەسڕین، هەوای پاکمان هەڵدەمژت. تاقە شتێک کە دەیانبینی، بریقە بوو. ئەوسا هەستمان دەکرد ئارامترین. هەستمان دەکرد کەمتر دەترسین. بۆ یەکەمین جار لە ژیانماندا هەستمان دەکرد خۆمانین.

هەندێکمان دزیمان لێ دەکردن. یەکەم جار شتی بچووک، کە پێمان وا نەبوو ئەوان بەدوایاندا بگەڕێن. چەتاڵێکی زیو لێرە و خوێدانێک لەوێ. تاکوتەرا قووم کۆنیاک. کوپێکی بە-گوڵ-نەخشێنراوی چا، کە بەلامانەوە گرینگ بوو هەمان بێت. ژێرپیاڵەیەکی جوانی بە-گوڵ-نەخشێنراو. گوڵدانێکی فەخفوری، لە هەمان تۆنی ڕەنگی سەوزی بوداکەی دایکم، کە لە نەفریت بوو. یەکێکمان دەیگوت: *من هەر زۆر سووک و هاسان حەزم لە شتی جوانە*. چنگێک پارەی وردە لەسەر ڕەفەی موبەق، کە چەند ڕۆژێک بوو هەر لەوێدا بوو. هەندێکی ترمان وەسوەسەی دزی لێی دابوون، بەڵام دەستیان پاراستبوو. هەڵبەت لەسەر خووڕەوشتمان پاداشت دەکراین. من تاقە کچەکارەکەر بووم، کە خانمەکەم ڕێگەی دابووم بچمە سەرەوە بۆ ژووری نوستنەکەی بۆ لای. هەموو زنجییەکان دەبوو لە خوارەوە لە موبەق بمێننەوە.

هەندێکیان بەبێ چ ئاگادارکردنەوەیەک دەریان دەکردین و هیچ نەماندەزانی کە ئاخۆ دەبێ چ هەڵەیەکمان کردبێ. مێردەکانمان بەردەوام پێیان دەگوتین: "تۆ زۆر جوانیت." ئەگەرچی بەلامانەوە زەحمەت بوو باوەڕ بکەین جوانین. هەندێکمان هێند دەستوپێ سپی بووین، کە دەمانزانی ناتوانین لە هەفتەیەک زیاتر بڕ بکەین. کە فراقینمان بۆ دادەنان، ئەوسا دەمانزانی بیرمان چووە گۆشتەکەیان بۆ لێبنێین. هەموو جارێک شۆربای شەشپەڕەی پرپۆڵەکەیانمان دەسووتاند. جوانترین پەرداخە کریستاڵەکانیانمان لە دەست بەردەبوونەوە و دەشکان. بە هەڵە پەنیرەکانیانمان فڕێ دەدان. هەوڵمان دەدا پاکانە بۆ ئەوە بهێنینەوە و دەمانگوت: "وامان زانی بۆگەنی کردووە." وەڵامیان دەداینەوە: "خۆی بۆنی وایە." هەندێکمان بۆی زەحمەت بوو لە ئینگلیزییەکەیان حاڵی بێت، کە هەر هیچ لەو ئینگلیزییە نەدەچوو کە ئێمە لە کتێبەکانمانەوە فێری بووبووین. دەمانگوت "بەڵێ،" کاتێ پرسیاریان لێ دەکردین کە ئاخۆ ناتوانین جلکە شۆراوەکانیان قەد بکەین. دەمانگوت "نەء!" کاتێ داوایان لێ دەکردین ئەرزەکە بسڕین. کاتێکیش پرسیاریان لێ دەکردین ئاخۆ گوارە ئاڵتوونەکانیانمان بینیوە، ئێمە زەردەخەنەمان دەهاتێ و دەمانگوت: "ئێ ئێ، بەڕاست؟" هەندێکی ترمان بۆ هەرشتێک پرسیارمان لێ کرابا، تەنها بە "ئمممممم" وەڵاممان دەدانەوە. هەندێکمان مێردەکانمان درۆیان بۆ کردبوون سەبارەت بە توانا و ئامادەگیمان بۆ چێشتلێنان. پێیان گوتبوون: *ژنەکەم پسپۆڕە و هەر وێنەی نییە لە لێنانی مریشکی تێکرانی و شۆربای خەستی پەتاتە*، بەڵام زووبەزوو دەر دەکەوت تەنها لە لێنانی برنجدا پسپۆڕین. هەندێکمان لەنێو موڵک و ماڵی خۆماندا گەورە بووبووین، کارەکەر و خزمەتکارمان هەبووە و کەس ئەمری بەسەردا نەکردبووین. هەندێکمان زۆر باش لەگەڵ منداڵەکانیاندا، کە پێمان وا بوو شەڕانگێز و دەنگزلن، هەڵمان نەدەکرد. هەندێکمان ناڕەزایەتیمان دەر

دەبڕی بەوەی کە سەبارەت بە ئێمە، کاتێ وایان دەزانی لە ژوورەکەدا نەماوین، بە منداڵەکانیان دەگوت: *"ئەگەر سەعی نەکەیت و زیرەک نەبیت، ئەوا ناچارت دەکەم ڕێک وەک لیلی ئەرز بسڕیت."*

زوربەیان هەر هیچ گوێیان پێ نەدەداین. کە پێویستیان پێمان دەبوو لەوێ بووین، بەڵام کە پێویستیان پێمان نەدەبوو، گورج دیار نەدەماین. دەخزاینە دواوە و بێدەنگ زەوییەکانیانمان دەسڕین، بریقەمان لە کورسی و مێز و قەنەفەکانیان دەهێنان، منداڵەکانیانمان دەشت، بەشگەلێک لە ماڵەکانیانمان، کە جگە لە ئێمە کەسی تر بۆی نەبوو بیانبینێت، گسک دەدان. زۆر بەدەگمەن دەدواین. کەممان دەخوارد. ئێمە دڵارا بووین. ئازا بووین. قەت نەدەبووینە مایەی کێشە و لێدەگەڕاین چیمان لێ دەکەن، لێمان بکەن. لێدەگەڕاین هەرکاتێ لێمان قایلن، ستایشمان بکەن. لێدەگەڕاین کاتێ تووڕەن، بەسەرماندا بقیژێنن. لێدەگەڕاین شتگەلێکمان بدەنێ، کە نە حەزمان لێیان و نە پێویستیشمان پێیان بوو، دەمانگوت: *ئەگەر ئەو بلوسەکۆنەی لێ وەرنەگرم، ئەوا ڕەنگە بە کەسێکی خۆبەشتزانم تێبگا.* بە پرسیار بۆژۆمان نەدەکردن، قەت بەرپەرچمان نەدەدانەوە، یان گلەوگازندەمان نەبوو. قەت داوای مووچەی زۆرمان نەدەکرد. لەبەر ئەوەی زوربەمان کچانی سادە و ساکاری گوندی بووین، کە هیچ بە ئینگلیزی قسەمان نەدەکرد و دەمانزانی لە ئەمەریکا چ چارەیەکی ترمان نییە ئەوە نەبێ، کە بە فلچە دەستشۆیی بشۆین و ئەرز بسڕین.

لە نامەکانماندا بۆ دایکانمان، قەت ناویانمان نەدەهێنان. لە نامەکانماندا بۆ خوشک و هاوڕێکانمان، قەت ناویانمان نەدەهێنان. ئاخر ئیشکردن وەک کارەکەر لە ژاپۆن لە نزمترین لیستی ئەو ئیشانەدایە، کە ژنان دەیکەن. لە نامەکانماندا دەماننووسی: *کێڵگەکەمان جێ هێشتووە و بۆ خانوویەکی خۆش لە شار گواستوومانەتەوە. لەوێ مێردەکەم ئیشی لای خێزانێکی خانەدان دۆزیوەتەوە. قەڵەو بووم. کەشاومەتەوە. باڵام کردووە، ئێستا*

*جلکی ژێرەوە لەبەر دەکەم. ستیان دەبەستم و گۆرەوی لەپێ دەکەم. سوخمەیەک دەبەستم لە لۆکە. من هەموو ڕۆژێک تا سەعات ۹ دەنووم و پاشنیوەڕوانیش لە دەرەوە، لەگەڵ پشیلەکەمدا بەسەر دەبەم. دەموچاوم گۆشتن بووە. سمت و کەفەڵم پانتر بووە. هەنگاوەکانم کورتتر بوون. خەریکم خۆم فێری خوێندنەوە دەکەم. دەچم بۆ وانەی فێربوونی پیانۆ. هەر تەواو شارەزای هونەری چێشتلێنانی ئەمەریکایی بووم و تازەکی لە پێشبڕکێیەکدا خەڵاتی یەکەمم لە دروستکردنی پای لیمۆدا وەرگرتووە. من دەزانم تۆ ئێرەت پێ خۆش دەبێ. جادەکان پان و بەرین و پاکن و بنیادەم پێویستی بەوە نییە کاتێ دەچێتە چیمەنەوە، پێڵاو دابکەنێ. زۆر جاران بیر لە تۆ دەکەمەوە و هەر بتوانم دەسبەجێ پارەت بۆ دەنێرم.*

جاروبار ڕووی دەدا کە مێردی یەکێکیان داوای لێ دەکردین لە ژووری کارەکەی قسەمان لەگەڵ بکا، لە کاتێکدا ژنەکەی لە دەرەوە بازاڕی دەکرد و ئێمەش نەماندەزانی ئاخۆ چۆن بتوانین بڵێین نەء. کاتێ دەچووین، لێی دەپرسین: هەموو شت باشە؟ بەزۆری سەرمان دادەخست و لە ئەرزەکەمان دەنۆڕی و دەمانگوت: "هەڵبەت، بێگومان، هەموو شت نایابە." ئەگەرچی ئەوەش ڕاست نەبوو، بەڵام کاتێ نەختێک سووکەدەستێکی لە شانمانەوە دەدا و لێی دەپرسین ئاخۆ دڵنیاین هەموو شت باشە، ئێمە هەموو جار ڕوومان وەرنەدەگێڕا. ئینجا پێی دەگوتین:" پێویست ناکا کەس بەمە بزانێت!" یان دەیگوت: "ژنەکەم وا زوو نایەتەوە." کاتێکیش بەسەر پێپلیکانەکەدا بۆ ژووری نوستنەکەی دەبردین و ڕێک لەسەر جێگەخەوەکە پاڵی دەخستین – ڕێک ئەو جێگەخەوەی کە هەمان ئەو بەیانییە ڕامان خستبوو – هۆن-هۆن دەگریاین، لەبەر ئەوەی دەمێک بوو کەس ئاوها لە ئامێزی نەگرتبووین.

هەندێکیان داوایان لێ دەکردین چەند وشەیەک بە ژاپۆنی بڵێین، تەنها بۆ ئەوەی گوێیان لە ئاوازی دەنگمان بێت. دەیانگوت: گرینگ نییە چ *دەڵێن*.

هەندێکیان داوایان لێ دەکردین جوانترین کیمۆنۆ ئاوریشمییەکانمان لەبەر بکەین و هێور-هێور پەنجە بە بڕبڕەی پشتیاندا بهێنین. هەندێکیان داوایان لێ دەکردین بە کەمەربەندە ئاوریشمییە گوڵگوڵییەکانمان بیانبەستینەوە و بە هەموو ئەو ناوانە بانگیان بکەین، کە بە دەمماندا دێن و دەحەپەساین کاتێ دەمانزانی ناویان چییە و چەند بەهاسانی ئەوەمان زانیوە. ئاخر چونکە لەوەوبەر قەت ناوەکانیانمان بە دەنگی بەرز گۆ نەکردبوو. هەندێکیان داوایان لێ دەکردین ناوە ڕاستەقینەکانی خۆمانیان پێ بڵێین. ناوێک، کە ئەوان پێشان بە چرپە دەیانگوت و دەیانگوتەوە، تا وای لێ دەهات خۆیشمان نەماندەزانی ناومان چییە. *میدۆری. میدوری. میدوری.* هەندێکیان بۆیان باس دەکردین، کە ئێمە چەند جوانین، ئەگەرچی خۆمان دەمانزانی هاکەزایی و ناشرینین. یەکێکمان دەیگوت: *لە ژاپۆن هیچ پیاوێک تەماشام ناکا.* هەندێکیان لێیان دەپرسین، کە ئێمە ئەوەمان پێ خۆشە یان ئاخۆ ئەوان لەگەڵمان خەراپن و ئایا ئێمە قایلین بەوەی ئەوان لەگەڵمان دەیکەن، ئێمەش دەمانگوت بەڵێ، لەبەر ئەوەی قایل بووین. یەکێکمان دەیگوت: *کاتێ لەگەڵ ئێوەدام، لانی کەم دەزانم دەژیم.* هەندێکیان درۆیان بۆ دەکردین. دەیانگوت: *من قەت پێشتر ئەمەم نەکردووە.* ئێمەش بە نۆرەی خۆمان درۆمان بۆ دەکردن. دەمانگوت: *ئێمەش.* هەندێکیان پارەیان دەداینێ، کە دەماننائاخنییە گۆرەوییەکانمانەوە و هەمان شەو بەبێ ئەوەی یەک وشە بڵێین، دەماندایە مێردەکانمان. هەندێکیان بەڵێنیان پێ دەداین لەبەر ئێمە واز لە ژنەکانیان بهێنن، ئەگەرچی دەمانزانی هەرگیز شتی وا ناکەن. هەندێکیان دەیانزانی لێیان دووگیانین. دەمانگوت: *مێردەکەم شەش مانگ زیاترە پەنجەی بەرم نەکەوتووە.* ئەوسا دەیانناردین و دەیانگوت: "دەبێ لەناوی ببەیت." دەیانگوت: "من پارەی هەموو تێچوونەکەی دەدەم." دەیانگوت: "دەسبەجێ ئیشێکت لە جێگەیەک بۆ دەدۆزمەوە."

یەکێکمان کەوتە هەڵەوە، ئەو پیاوەی خۆش ویست و هێشتا هەر شەو

و ڕۆژ بیری لێ دەکاتەوە. یەکێکمان هەر هەموو شتێکی بۆ مێردەکەی گێڕایەوە و ئەویش بە کلکەئەرزسرپێک کەوتە وێزەی و پاشان کروشکەی کرد و گریا. یەکێکمان هەموو شتێکی بۆ مێردەکەی گێڕایەوە، ئەویش تەڵاقی دا و بۆ لای دایک و باوکی لە ژاپۆن هەناردەوە، کە ئێستا لەوێ ڕۆژانە دە سەعات لە ناگانو لە ئاوریشمچنییەکدا ئیش دەکا. یەکێکمان هەموو شتێکی بۆ مێردەکەی گێڕایەوە، ئەویش لێی بوورا و لە بەردەمیدا دانی بە دوو گوناهی خۆیدا نا. پێی گوت: *من ژنێکی ترم لەو سەرەوە لە کولوسا هەیە*. یەکێکمان هیچی بۆ کەس نەگێڕایەوە و هێدی-هێدی ئەقڵی لەدەست دا. یەکێکمان نامەی بۆ ماڵەوە نووسی و ڕاوێژی بە دایکی، کە هەمیشە دەیزانی دەبێ بنیادەم چ بکا، کرد، بەڵام دایکی قەت چ وەڵامێکی نەدایەوە. دەیگوت: *من دەبێ بەتەنیا ئەم کێشەیە تێپەڕێنم*. یەکێکمان قۆڵەکانی جلکە بووکێنییە ئاوریشمەکەی پڕ کردن لە بەرد و خۆی هەڵدایە زەریا، ئێمەش هێشتا ڕۆژانە دوعای بۆ دەکەین.

چەند کەسێکمان دواجار ملمان دا، کە لە هۆتێلە پەمەییەکانی ژوورِ هۆڵەکانی بلیارد و دوکانەکانی مەیفرۆشی، لە هەرە ناوچە قەبزەکانی شارەکانیاندا ئیشیان بۆ بکەین. لە پەنجەرەکانی نهۆمی دووەمی (خانووبەرەی تۆکیۆ)وە بانگمان دەکردن، کە لەوێ گەنجترینەکانمانی لێ بوون و تەمەنیان ئەوپەڕی دە ساڵان بوو. لە (خانووبەرەی یوکوهاما) بە باوەشێنە هەتاوییەکانمانەوە، کە لە کاغەزی ڕەنگاوڕەنگ دروست کرابوو، چاومان لێ دادەگرتن و بە نرخێکی باش هەموو ئەو شتانەمان دەدانێ، کە ژنەکانیان لە ماڵەوە حەزیان نەدەکرد بیاندەنێ. لە (خانووبەرەی ئالوها) بە دەنگێکی کچانەوە خۆمان بە ناوەکانی میستریس ساکی و خاوەن شکۆ میس گوڵەگێلاس پێ دەناساندن و کاتێکیش لێیان دەپرسین لەکوێوە هاتووین، ئێمە زەردەمان دەهاتێ و دەمانگوت: "ئۆهـ لە جێگەیەکی نزیک (کیوتو)وە." لە نیوئیدن نایت کلوب سەمامان لەگەڵ دەکردن و بۆ هەر

چارەکەساعاتێک لە کاتەکەمان، داوای پەنجا سەنتمان لێ دەکردن. خۆ ئەگەر بیانویستبا لەگەڵمان بۆ نهۆمی سەرەوە بێن، ئەوا پێمان دەگوتن کە ئەوە بۆ هەرجارێک پێنج دۆلار، یان تا بەیانی مانەوە لە ژوورەکەدا، بیست دۆلار دەکا. کاتێک ئیشی خۆیان لەگەڵماندا تەواو دەکرد، ئێمە پارەکانمان دەدایە بەڕێوەبەرەکانمان، کە بەدرێژاییی شەو قوماریان دەکرد و بە شێوەیەکی ڕێکوپێکیش بەرتیلیان دەدایە پۆلیس و نەشیاندەهێشت لەگەڵ هیچکەس لە هاوڕەگەزانی خۆماندا بنووین، دەیانگوت: *کچێکی جوانکیلەی وەک تۆ، هەزار دراوی زێڕ دێنی.*

جاروبار کە لەگەڵیان دەنوستین، بیرمان لە مێردەکانمان، کە لێیان هەڵهاتبووین، دەکردەوە. لە خۆمان دەپرسی: *هەر بەڕاست، ئەو ئەوەندە شەڕانگێز بوو؟ هێند دڵڕەق؟ هێند زەوقسز بووە؟* جاروبار هەستمان دەکرد خەریکین دەکەوینە داوی عەشقی سەرکارەکانمانەوە، کە لە کاتی گەڕانەوەماندا لە کێڵگەوە بۆماڵەوە و لەژێر هەڕەشەی چەقۆدا، بە بارمتە دەیانگرتین. دەمانگوت: *ئاخر ئەو شتومەکمان دەداتێ. ئەو قسەمان لەگەڵ دەکا. ڕێگەمان دەدا بڕۆین و پیاسە بکەین.* جاروبار بە خۆمان دەگوت، دوای دوو ساڵێک ئیشکردن لە ئیوریکا هاوس، پارەوپوولێکی وامان دەبێ، کە بتوانین بلیتێکی بۆ گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆمان پێ بکڕین، بەڵام لە کۆتاییی ئەو ساڵەدا، جگە لە پەنجا سەنت و ئاتەشەکێکی* ترسناک، خاوەنی هیچ نەبووین. بۆ ساڵی داهاتوو بە خۆمان دەگوت: *ئێ، بەڵکوو ئەمە خوایە ساڵی داهاتوو بتوانین.* بەڵام تەنانەت جوانکیلەترینەکانمان دەیانزانی کە ڕۆژ و ڕۆژگارمان بەسەر دەچێ، لەبەر ئەوەی لەو ئیشەی ئێمەدا، کاتێ بنیادەم تەمەنی دەبێتە بیست ساڵ، ئیتر یان ئەوەتا دەمرێ، یاخود وەدەر دەنرێت.

---

* ئاتەشەک: سوزەنەک، نەخۆشییەک کە لە ڕێگەی سێکسەوە دووچاری کۆئەندامی زاووزێی ئافرەت دەبێ.

یەکێکیان کە نابێ ناوەکەی ئاشکرا بکەین، ئێمەی لەو قەحبەخانەیەی ئیشمان لێی دەکرد، کڕییەوە و لەگەڵ خۆیدا هێناینی بۆ خانوویەکی گەورە، کە کەوتبووە جادەیەکی ئەمبەر و ئەوبەر بە-درەخت-چێنراو لە مونتیکیتو. گوڵەبامی لە تاقی پەنجەرەکاندا، مێز لە مەرمەڕ، قەنەفەی چەرم، کاسەی شووشەی پڕ لە چەرەس بۆ ئەگەری هەبوونی میوان. سەگێکی سپیی لەدڵداشیرینیش هەبوو، کە بە(شیرو)، بە ناوی هەمان ئەو سەگەوە کە لە ژاپۆن بە جێمان هێشتبوو و ڕۆژی سێ جاران بەشادمانی لەگەڵیدا دەچووینە دەرێ، بانگمان دەکرد. هەر لەو خانووەدا یەخچاڵێکی کارەبایی هەبوو، گرامافۆنێک، ڕادیۆیەکی ماجیستیک. ترومبێلێکی تی فورد لەسەر ڕێگەکە، کە هەموو یەکشەموانێک دەمانخستە ئیش و پیاسەیەکمان پێ دەکرد. کارەکەرێکی لەڕولاواز بە ناوی کونسیولو، کە خەڵکی فیلیپین و کێکی هێلکە و پای نایابی دروست دەکردن و پێشبینیی هەر هەموو پێداویستییەکانمانی دەکرد. ئەگەر شادمان بووینایە، دەیزانی. ئەگەر غەمگین بووینایە، دەیزانی. دەیزانی ئەگەر شەوی پێشتر شەرمان بووایە یان ئەگەر خۆش لێمان گوزەرا بووایە. بۆ هەر هەموو ئەوانە ئێمە تا ئەبەد سوپاسگوزاری مێردە تازەکانمان بووین، چونکە ئەگەر ئەوان نەبوویانە، ئەوا ئێمە هێشتا لەسەر جادە دەبووین. یەکێکمان دەیگوت: هەر کە چاوم پێی کەوت، یەکسەر زانیم ئیدی ڕزگار بووم. بەڵام جاروبار بیرمان لەو پیاوانە دەکردەوە، کە بەجێمان هێشتبوون. دەمانگوت بڵێی ڕۆژی دوای ئەوەی جێمان هێشتوون، هەموو شتەکانمانیان سووتاندبن؟ بڵێی نامەکانمانیان سووتاندبن؟ بڵێی ڕقیان لێمان بێ؟ بڵێی بیرمان بکەن؟ بڵێی چ زیندوو بین چ مردوو، گوێمان پێ بدەن؟ بڵێی ئێستاش وەک باخەوان لای خانەوادەی بارنهام لە سوتەر ستریت ئیش بکەن؟ بڵێی نێرگسەکەیانیان چاندبێ؟ بڵێی چیمەنەکەیانیان بڕیبێ؟ ئایا هێشتا هەموو ئێوارەیەک بەتەنیا شێو لە موبەقە گەورەکەی میسز بورنهام دەکەن،

یاخود دواجار بوونەتە هاوڕێی ئەو کارەکەرە زنجییەی کە میسز بورنهام لە هەموویان زیاتری خۆش دەویست؟ بڵێی ئێستاش شەوانە بەر لەوەی بنون، سێ لاپەڕە لە نامیلکەی زانیارینامە لەبارەی باخەوە بخوێننەوە؟ ئایا خەون بەوەوە دەبینن، کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ببنە خزمەتکاری یەکەم؟ جاروبار عەسرێکی درەنگ، کاتێ کە خەریک بوو خۆر ئاوا دەبوو، فۆتۆ زەردهەڵگەڕاوەکانیانمان لە جانتاکانمان دەر دەهێنان و بۆ دواجار تەماشامان دەکردن. بەڵام هەرچی هەوڵمان دەدا، نەماندەتوانی قەناعەت بە خۆمان بهێنین، کە فریان بدەین.

هەندێکمان هێشتا سێیەم ڕۆژمان بوو لە ئەمەریکا، پشتمان بەسەر تەشتە بەزینک ڕووپۆشکراوەکانیاندا نووشتاندبۆوە و بێدەنگ جلک و پەڕۆوپاتاڵەکانیانمان دەشت: بەرگەپشتی و بەرگەدۆشەکی پەڵەپەڵاوی، دەسەسڕی پیس، ئێخەی چڵکن، جلی ژێرەوەی سپیی هێند جوان، کە ئێمە وامان دەزانی لە سەرەوە لە بەری دەکەن نەک لە ژێرەوە. ئێمە لە ژێرزەمینی جلکشۆریی گەڕەکە ژاپۆنییەکان، لە هەرە وێرانترین گەڕەکی شارەکانیان - سان فرانیسیکۆ، ساکرامێنتو، سانتا باربارا، ئێل. ئای – ئیشمان دەکرد و هەموو بەیانییەک بەر لە کازیوە، لەگەڵ مێردەکانماندا هەڵدەستاین و جلکمان دەشت و ئاومان دەکولاند و ئەرزمان دەسڕی. شەوانیش کاتێ گسکەکانمان دادەنان و لەسەر تەختەخەوەکانمان ڕادەکشاین، خەونمان دەبینی، کە هێشتا هەر شت دەشۆین. ساڵانێکی زۆر هەمان ئەو خەونانەمان دەبینین. تەنانەت ئەگەر ئەو هەموو ڕێگەیەشمان بەرەو ئەمەریکا نەبڕیبا تا لە کونجێکی بەپەردەجیاکراوە لەودیو (ڕویاڵ هاند لاوندرای)یەوە بژین، دەمانزانی ناتوانین بۆ ماڵەوە بگەڕێینەوە. ئاخر باوکانمان بۆیان دەنووسین: *ئەگەر بۆ ماڵەوە بگەڕێیتەوە، ئەوا هەموو خێزانەکە شەرمەزار دەکەیت. ئەگەر بۆ ماڵەوە بگەڕێیتەوە، ئەوا قەت خوشکە گەنجترەکانت شوو ناکەن. ئەگەر بۆ ماڵەوە بگەڕێیتەوە، ئەوا*

*هەرگیز هیچ پیاوێک نایەوێت*. ئەوسا ئێمەش لەو گەڕەکە ژاپۆنیانەدا، لەگەڵ مێردە تازەکانماندا دەماینەوە و بەر لە وادەی خۆی، پیر دەبووین.

زۆر دەگمەن لەو گەڕەکە ژاپۆنیانەدا ئەوانمان دەبینین. ئێمە هەرحەوت ڕۆژەکەی هەفتە لە باڕی (نانی نیوەڕۆ) و دوکانی ماکەرۆنەی مێردەکانمان، خواردنمان دادەنان و ڕەگوڕیشە و نەسەبی هەر هەموو مشتەرییەکانمان دەناسین: یاماموتو – سان، ناتسوهارا – سان، ئیتو – سان، کودامی – سان، ژوورەکانمان لە لۆقەنتە هەرزانەکانی مێردەکانماندا گسک دەدان، ڕۆژی دوو جاریش چێشتمان بۆ میوانەکانیان، کە ڕێک لە خۆمان دەچوون، لێدەنا. ئێمە سەوزەواتەکانمان لە فوجیوکا گروسێری، کە هەر هەموو ئەو شمەکانەی دەفرۆشت کە لە خەیاڵماندا بوو، لە ژاپۆن هەبوون: چای سەوز، سابوونی میتسوا، بخوور، مرەبای هەڵوژە، پەنیری تازەی ڕووەکی، گژوگیای ئاویی وشککراو دژی ملەخڕێ و هەڵامەت. عارەقی خۆماڵی ژاپۆنیمان بۆ مێردەکانمان لە هۆڵی بلیاردەکەی خوار قەحبەخانەکەی نێوان سووچی تایرد ستریت و مایندا دەکڕی، بەڵام ئاگادار بووین کە یەکەم جار پۆشینە سپییەکانمان لەبەر بکەین، تا کەس لەبەر دەروازەکەدا بە قەحبە تێمان نەگا. جلکەکانمان لە بازاڕی (یادا) لە یدیس شۆپ دەکڕین و پێڵاوەکانیشمان لە ئاساهی شو، کە لەوێ هەر بەڕاستی پێڵاوی نمرەی پێی ئێمە هەبوو. کرێمی ڕووخسارمان لە دەرمانخانەی تێنشودو دەکڕی. هەموو یەکشەمموانێک بۆ مەلەگە گشتییەکە دەچووین و لەگەڵ هاوسێ و هاوڕێکانماندا دەکەوتینە زەم و زەمکاری: *ئەرێ ڕاستە کیسایو نەیهێشتووە مێردەکەی لە دەرگەی حەوشەوە بێتە ژوورەوە؟ ڕاستە کە میکیکو هەر بەڕاستی ڕەدووی قومارچییەک لە (تویو کلوب) کەوتووە؟ ئەرێ ئەوە هاکیو چیی لە پرچی کردووە؟ هەر دەڵێی کونەجرجە*. کاتێ ددانمان بئێشایە، دەچووین بۆ یوشیناگاس دێنتال کلینیک، بۆ پشتئێشە و ئازاری ئەژنۆ بۆ لای دوکتۆر

هایانوی نوژداری سوژنی دەچووین، کە هونەری مەسازی شیتاسوشی دەزانی. خۆ ئەگەر لە کاروباری دڵیشدا پێویستمان بە ئامۆژگاری بوایە: *ئاخۆ دەبێ جێی بهێڵم یان لەلای بمێنمەوە؟* ئەوا دەچووین بۆ لای میسز موراتا، ئەو ژنە دەستگرەوەیەی لە خانووە شینەکەی سێکۆند ستریت، لە ژوور (ئاساکاوا پاون)ەوە دەژیا، کە لەوێ لە موبەقەکەدا بە سەرێکی شۆڕ و دەستەوئەژنۆ لەلای دادەنیشتین و چاوەڕێمان دەکرد تا پەیامێکی لەلایەن خواوەندەکانەوە پێ بدرێت. دەیگوت: *ئەگەر ئێستا جێی بهێڵیت، ئەوا قەت کەسی ترت بە نسیب نابێت.* هەر هەموو ئەوە لە چوار گەڕەکی گەورەی شاردا ڕووی دەدا، کە ژاپۆنیتر بوو لەو گوندەی لە ژاپۆن جێمان هێشتبوو. من دەمگوت: *ئەگەر چاو بنووقێنم، تەنانەت نازانم لە وڵاتێکی بێگانەدا دەژیم.*

هەموو جارێک کە گەڕەکە ژاپۆنییەکانی خۆمان جێ دەهێشتن و دەچووینە سەر جادەی پانوپۆڕ و خاوێنی شارەکانیانەوە، هەوڵمان دەدا سەرنجی خەڵک بۆ لای خۆمان ڕانەکێشین، وەک ئەوان جلکمان دەپۆشی، وەک ئەوان بە ڕێگەدا دەڕۆیشتن، ئاگامان لە خۆمان دەبوو، کە بەکۆمەڵ نەڕۆین. لە بەردەمیاندا خۆمان بچووک دەکردەوە. دەمانگوت: *ئەگەر شوێن و قەبارەی خۆمان بزانین، ئەوا ئەوان وازمان لێ دێنن.* هەموو شتێکمان دەکرد، تا جاڕزیان نەکەین. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوان ژیانیان لێ قورس دەکردین. پیاوەکانیان دەیانکێشا بە پشتی مێردەکانماندا و هاواریان دەکرد: "ببوورە!" هاوکاتیش کڵاوەکانیان لەسەر دادەکەندن. منداڵەکانیان بەردیان تێ دەگرتین. بۆیەکانیان هەمیشە دوایین کەس دەهاتن بەلامانەوە. دەرکەوانەکانیان لە شانۆکانیاندا بۆ بانیژەکانی سەری سەرەوەیان دەبردین، لەسەر کورسییە هەرە خەراپەکان دایان دەنیشاندین و ئەو شوێنانەیان ناو نابوون بەهەشتی زنجییەکان. سەرتاشەکانیان قژیان نەدەتاشین. دەیانگوت: قژتان بۆ مقەستەکانی ئێمە زبرە. کاتێ لە

ترێنەکانیاندا زۆر لە نزیک ژنەکانیانەوە ڕادەوەستاین، خێرا پێیان دەگوتین لا بچین، ئێمەش پێمان دەگوتن: "ببوورە!" و زەردەخەنەمان بۆ دەکردن و دەچووینە ترێنێکی ترەوە. ئاخر مێردەکانمان فێریان کردبووین کە تاقە شتێک بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیان بیکەین، ئەوەیە ڕووبەڕوویان نەبینەوە. بۆیە بەزۆری لە ماڵەوە، لە گەڕەکە ژاپۆنییەکانی خۆماندا دەماینەوە، لەوێ و لەنێو هاوشێوەکانی خۆماندا، هەستمان بە دڵنیایی دەکرد. خۆمان فێر کردبوو لە دوورەوە لەگەڵیان بژین و تا پێمان بکرێ مەودایان لێ بگرین.

بەڵێنمان بە خۆمان دەدا، دەبێ ڕۆژێک جێیان بهێڵین. بەڵێنمان بە خۆمان دەدا، دەبێ خۆمان بڕەتێنین و پارەی پێویست کۆ بکەینەوە، تا خۆمان بگەیەنینە جێگەیەکی تر. ڕەنگبێ ئەرژەنتین یان مەکسیکۆ، ساو پاولو یان بەرازیل و هاربین، یاخود مانچورێت، کە مێردەکانمان بۆیان باس کردبووین ژاپۆنییەک لەوێ دەتوانێ وەک شازادە بژی. دەیانگوت: *پارساڵ براکەم ڕۆیشت بۆ ئەوێ و هەر زۆر نایاب لێی گوزەرا.* بەڵێنمان بە خۆمان دەدا، کە دەبێ لە سەرەوە دەست پێ بکەینەوە. مێزی میوەفرۆشیی خۆمان دابنێین. کۆمپانیای بازرگانیی خۆمان دابنێین. هۆتێلی دەرەجە یەکی خۆمان دابنێین. دەبێ باخێکی گێلاس بڕوێنین. بێستانی خورماڵو، هەزار هێکتار کێڵگەی زێرینی بەپیت. دەبێ خۆمان فێری شتگەلێک بکەین. دەبێ شتێک بکەین. باخچەیەکی منداڵان دابنێین. پەرستگەیەک ڕۆبنێین. یەکەمین سەفەرمان بە قەتار بکەین. ساڵی جارێک و لە یادی هاوسەرگیریماندا، سووراوێک بکەین و بۆ خۆمان بچینە دەرەوە و نانێک بخۆین. لە جێگەیەکی خۆش، *بە سفرەی سپی و چلچراوە*. کاتێ پارەی تەواو پاشەکەوت دەکەین تا یارمەتیی دایکان و باوکانمان لەپێناو ژیانێکی ئاسوودەدا بدەین، ئەوسا کەلوپەلەکانمان دەپێچینەوە و سەفەر بۆ ژاپۆن، بۆ ماڵەوە دەکەینەوە. ئەوە دەکەوێتە پاییزەوە. باوکانمان لە

دەرەوەن لە کێڵگەکان و لە شەنکردنن. ئێمە بە پێ بەناو برەدرخت و دارتووەکاندا دەڕۆین، بەلای دارگوێژە گەورەکە و ئەستێرکی سەوسەنی ئاوییدا تێدەپەڕین، کە جاران بەهاران سەرەمێکوتەمان تێدا دەگرت. سەگەکانمان بە پرتاو بەرەو پیرمان دێن. هاوسێکانمان دەستمان بۆ رادەوەشێنن. دایکانمان لەلای چاڵاوەکەوە و بە قۆڵ و باسکی پێچراوەوە دانیشتوون و برنج بۆ ژەمی شێو دەشۆنەوە. کاتێ دەمانبینن، هەڵدەسنە سەر پێ و زەق-زەق تەماشامان دەکەن. پێمان دەڵێن: "*کچە بچکۆلە، ئەری توو ئەو خوایە ئەوە تۆ لەکوێ بوویت؟*"

بەلام تا ئەو کاتە، دەبێ قەیرێکی تریش لە ئەمەریکا بمێنینەوە و ئیشیان بۆ بکەین، ئاخر چۆن دەتوانن بەبێ ئێمە دەرەقەت بێن؟ کێ شیلکەکانیان لە بێستانەکە بۆ دەڕنێ؟ کێ میوەکانیان لە درەختەکان بۆ لێدەکاتەوە؟ کێ گێزەرەکانیان بۆ دەشواتەوە؟ کێ تەوالێتەکانیان بە فلچە بۆ خاوێن دەکاتەوە؟ کێ جلکەکانیان بۆ دەدوورێتەوە؟ کێ کراسەکانیان بۆ ئوتوو دەکا؟ کێ لۆکەی باڵشتەکانیان بۆ شی دەکاتەوە؟ کێ سەرچەفەکانیان بۆ دەگۆڕێت؟ کێ بەرچای بۆ منداڵەکانیان ئامادە دەکا؟ کێ پیرەکانیان دەشوا؟ کێ گوێ بۆ حەکایەتەکانیان رادەدێرێت؟ کێ نهێنییەکانیان دەپارێزێت؟ کێ درۆکانیان بڵاو دەکاتەوە؟ کێ بە شانوباڵیاندا هەڵدەدا؟ کێ گۆرانییان بۆ دەڵێ؟ کێ سەمایان بۆ دەکا؟ کێ بەسەریاندا دەگرێ؟ کێ لاکەی تری ڕومەتیشیان بۆ ڕادەگرێ؟ تا ئەو کاتەی ڕۆژێک لە ڕۆژان – لەبەر ئەوەی ئێمە شەکەت بووین، لەبەر ئەوەی ئێمە پیر بووین، لەبەر ئەوەی لە قەرەی ئەوە دەهاتین – لێیان ببوورین؟ ئەوسا کراسە کیمۆنۆکانمان قەد کردن و خستماننە باوڵەکانمانەوە و بۆ ماوەی چەندین ساڵ دەرمان نەهێنانەوە.

# ساوا

ئێمە لە پەنجاوپێنج پلەی گەرمای هاوین و لەژێر داربەڕووەکاندا منداڵمان بوو. ئێمە لە هەرە ساردترین شەوەکانی ساڵ، لەبەر سۆپای داری کوختە یەکژووریيەکاندا منداڵمان بوو. ئێمە شەش مانگ دوای گەیشتنمان، لە دوورگە بە-با-کوتراوەکانی دیلتادا منداڵمان بوو، ساواکانیشمان گچەکە و شلوشۆڕ و دوای سێ ڕۆژان دەمردن. ئێمە دوای نۆ مانگ لە گەیشتنمان، منداڵمان بوو، ساواکانیش بێخەوش و قژێکی ڕەشی پڕیان پێوە بوو. لە ڕەزە تۆزوخۆڵاوییەکاندا، لە ئیلک گروڤ و فلورین منداڵمان بوو. لە بێستانە دوورەکاندا لە ئیمپریال ڤالی، تەنها بە یارمەتیی مێردە ڕاستینەکانمان، کە لە نامیلکەی ڕێنومایيی کەیبانووەوە فێری مامانی بووبوون، بەوەی دەبێ چی بکەن و چی نەکەن، منداڵمان بوو. *یەکەم شت دەبێ ئاو لە لەگەنێکدا بکوڵێنرێت*... لەبەر تیشکی چرایەکی نەوت و لەسەر سەرچەفێکی ئاوریشمیی کۆن، کە لە ژاپۆنەوە لە جانتاکەماندا پێمان بوو، منداڵمان بوو. *سەرچەفەکە هێشتا بۆنی دایکمانی پێوە بوو.* وەک ماکیو لە کادانێکدا، لە دەرەوەی ماکسوێل، ڕاکشاو لەسەر دۆشەکێکی ئەستوور لە قوڕچوم منداڵمان بوو. *حەز دەکەم نزیکی ئاژەڵان بم.* تەنیا تەنیا لە باغێکی سێودا لە (سێباستوپول) منداڵمان بوو، دوای ئەوەی لە بەیانییەکی نائاساییی گەرمی پاییزێکدا، لە سەرەوە لە چیاکە بەدوای داردا دەگەڕاین. *ناوکیم بە چەقۆکەم بڕی و لە باوەشمدا بۆ ماڵەوەم*

*هێنایەوە.* لە خێمەیەکدا، لە لیڤینگستون بە یارمەتیی، مامانێکی ژاپۆنیی منداڵمان بوو، کە لە نزیکترین شارەوە زیاتر لە سێ میلی بە عارەبانە بڕیبوو. لە شارانێکدا منداڵمان بوو، کە هیچ پزیشکێک قایل نەدەبوو بمانبینێ، خۆمان ناوکەپەتکی خۆمان شت. یەکێکمان دەیگوت: *دایکم بینیوە کە زۆر کەڕەت وای کردووە.* لە شارانێکدا منداڵمان بوو، کە تەنها یەک پزیشکیان تێدا و هەقدەستەکەیشیمان پێ نەدەدرا. بە یارمەتیی دوکتۆر ڕینگواڵت منداڵمان بوو، کە هەقدەستەکەی لێ وەرنەدەگرتین. دەیگوت: پارەکە بۆ خۆتان هەڵبگرن. لەنێو هاوشێوەکانی خۆماندا لە کلینیکی منداڵبوونی تاکاهاشی، لە (کلیمینت ستریت) لە سان فرانسیسکۆ منداڵمان بوو. لە نەخۆشخانەی کاوابارا، لە نورس فایفس ستریت لە سان جۆیس منداڵمان بوو. لەپشتی لۆرییە فۆردەکەی مێردەکانماندا، لە جادەیەکی پڕ لە تاسەدا لە (کاستروڤیل) منداڵمان بوو. *ساواکە بەر لە وادەی خۆی لەدایک بوو.* لەسەر ئەرزێکی گڵی بەڕۆژنامەپۆشراو، لە کوختێکدا لە فرێنچ کامپ منداڵمان بوو، ئەوانەش گەورەترین منداڵ بوون، کە مامانەکە بەدرێژاییی ژیانی بینیبوونی و کێشیان پێنج هەزار و حەوت سەد گرام بوو. بە یارمەتیی ژنی ماسیفرۆشەکە، میس کوندو، منداڵمان بوو، کە دایکمانی لە ژاپۆن دەناسی. دەیگوت: *دایکتان تا ڕادەیەک جوانترین کچی گوند بوو.* لەودیو پەردەیەکی دانتێلەوە، لە سەرتاشخانەکەی ئاداچیس لە گاردێنا منداڵمان بوو، لە کاتێکدا مێردەکانمان تەراشی هەفتانەیان بۆ ئاغای ئۆتا دەکرد. ئێمە دەستوبرد، لە باڵەخانەکەی ژووور (هایگو تێن سێنت) منداڵمان بوو؛ بە کۆڵەگەی تەختەخەوەکەوە بەسترابووینەوە و لە کاتێکدا نەفرەتمان لە مێردەکانمان دەکرد، منداڵمان بوو. *هاوارمان دەکرد ئەمە خەتای ئێوە بوو.* ئەوانیش سوێندیان دەخوارد، کە ئیدی چیتر دەستیان بەرمان ناکەوێت. سەعات پێنجی بەیانی لە ژووری ئووتووخانەکەی (ئێگل هاند لاوندتری) منداڵمان بوو و

*هێنایەوە.* لە خێمەیەکدا، لە لیڤینگستون بە یارمەتیی، مامانێکی ژاپۆنیی منداڵمان بوو، کە لە نزیکترین شارەوە زیاتر لە سێ میلی بە عارەبانە بڕیبوو. لە شارانێکدا منداڵمان بوو، کە هیچ پزیشکێک قایل نەدەبوو بمانبینێ، خۆمان ناوکەپەتکی خۆمان شت. یەکێکمان دەیگوت: *دایکم بینیوە کە زۆر کەرەت وای کردووە.* لە شارانێکدا منداڵمان بوو، کە تەنها یەک پزیشکیان تێدا و هەقدەستەکەیشیمان پێ نەدەدرا. بە یارمەتیی دوکتۆر ڕینگواڵت منداڵمان بوو، کە هەقدەستەکەی لێ وەرنەدەگرتین. دەیگوت: پارەکە بۆ خۆتان هەڵبگرن. لەنێو هاوشێوەکانی خۆماندا لە کلینیکی منداڵبوونی تاکاهاشی، لە (کلیمینت ستریت) لە سان فرانسیسکۆ منداڵمان بوو. لە نەخۆشخانەی کاوابارا، لە نورس فایفس ستریت لە سان جۆیس منداڵمان بوو. لەپشتی لۆرییە فۆردەکەی مێردەکانماندا، لە جادەیەکی پڕ لە تاسەدا لە (کاستروڤیل) منداڵمان بوو. *ساواکە بەر لە وادەی خۆی لەدایک بوو.* لەسەر ئەرزێکی گڵی بەڕۆژنامەپۆشراو، لە کوختێکدا لە فرێنچ کامپ منداڵمان بوو، ئەوانەش گەورەترین منداڵ بوون، کە مامانەکە بەدرێژاییی ژیانی بینیبوونی و کێشیان پێنج هەزار و حەوت سەد گرام بوو. بە یارمەتیی ژنی ماسیفرۆشەکە، میس کوندو، منداڵمان بوو، کە دایکمانی لە ژاپۆن دەناسی. دەیگوت: *دایکتان تا ڕادەیەک جوانترین کچی گوند بوو.* لەودیو پەردەیەکی دانتێلەوە، لە سەرتاشخانەکەی ئاداچییس لە گاردێنا منداڵمان بوو، لە کاتێکدا مێردەکانمان تەراشی هەفتانەیان بۆ ئاغای ئۆتا دەکرد. ئێمە دەستوبرد، لە باڵەخانەکەی ژووور (هایگو تێن سێنت) منداڵمان بوو؛ بە کۆڵەکەی تەختەخەوەکەوە بەسترابووینەوە و لە کاتێکدا نەفرەتمان لە مێردەکانمان دەکرد، منداڵمان بوو. *هاوارمان دەکرد ئەمە خەتای ئێوە بوو.* ئەوانیش سوێندیان دەخوارد، کە ئیدی چیتر دەستیان بەرمان ناکەوێت. سەعات پێنجی بەیانی لە ژووری ئووتووخانەکەی (ئێگل هاند لاوندتری) منداڵمان بوو و

هەمان شەویش مێردەکانمان لەسەر تەختەخەوەکانمان کەوتنەوە ماچ کردنمان. من بە مێردەکەم گوت: *"ناتوانیت چاوەڕێ بکەیت؟"* بێدەنگ وەک دایکانمان، کە قەت نەیانقیژاندبوو، یان نرکەونالەیان نەکردبوو، منداڵمان بوو. یەکێکمان دەیگوت: *دایکم تا ئەو ڕۆژەی مەستی بە بەرەژان کرد، هەر لە مەرەزەکەدا ئیشی دەکرد.* وەک (نوگیکو) بە گریانەوە منداڵمان بوو، کە تای لێ هات و تا سێ مانگ لەسەر تەختەنوێنەکەی نەهاتە خوارەوە. ئێمە سووک، بە دوو سەعات منداڵمان بوو، بەڵام سەرئێشەیەک گرتینی، کە تا پێنج ساڵ بەری نەداین. ئێمە شەش مانگ دوای ئەوەی مێردەکانمان جێیان هێشتین، منداڵمان بوو، وا ئێستایش حەزمان دەکرد هەرگیز منداڵەکانمان جێ نەهێشتبان. *یەکێکمان دەیگوت: دوای منداڵەکەم، ئیتر نەمتوانی دووگیان ببم.* بە نهێنی لە دارستان منداڵمان بوو، کە مێردەکانمان سوور دەیانزانی لەوان نین. لەسەر سەرچەفێکی گوڵگوڵیی ڕەنگبواردوو لە قەحبەخانەیەکدا، لە ئۆکلاند منداڵمان بوو، لە کاتێکدا گوێمان بۆ ئەو ئاخوئۆفانە ڕادێرابوو، کە لەودیو دیواری ژوورەکەی تەنیشتمانەوە دەهات. لە پانسیۆنێک لە پێتالوما، دوو هەفتە دوای ئەوەی لە ماڵی (کارمیشاڵ)ی قازی لە سەرەوە، لە (ڕەشان هیل) دەر چووبووین، منداڵمان بوو. دوای ئەوەی خواحافیزیمان کرد لە (میسز لیپینکوت)ی خانەخوێکەمان، کە حەزی نەدەکرد کارەکەرێکی دووگیان پێشوازی لە میوانەکانی بکات، منداڵمان بوو، دەیگوت: *بەکورتی و بەپوختی بڵێم، ئەوە بۆ ئێمە شتێکی جوان نییە.* بە یارمەتیی ژنی سەرکارەکەمان، (سینیۆرا سانتوس)، منداڵمان بوو، کە ڕانی دەگرتین و پێی دەگوتین هێز بدەینە بەر خۆمان. ئێمپوژ! ئێمپوژ! لە کاتێکدا مێردەکانمان لە چاینا تاون قوماریان دەکرد، منداڵمان بوو، کاتێک بۆ بەیانی بە سەرخۆشی بۆ ماڵەوە گەڕانەوە، تا پێنج ڕۆژ قسەمان لەگەڵدا نەکردن. ئاخر *داهاتی هەر هەموو بەروبوومەکەیان بە تاقە شەوێک*

*دۆڕاندبوو.* ئێمە لە ساڵی مەیمووندا منداڵمان بوو. لە ساڵی کەڵەشێردا منداڵمان بوو. ئێمە لە ساڵانی سەگ و لە ساڵانی هەژدیها و لە ساڵانی جرجدا* منداڵمان بوو. وەک ئاوراکو، کە مانگ چوارده بوو، منداڵمان بوو. ئێمە رۆژێکی یەکشەممە لە کوختێکدا لە ئینسیتا، منداڵمان بوو، رۆژی دواتر ساواکانمان لە کۆڵ بەستن و بۆ بەرڕنین، بۆ بێستانەکان رۆیشتین. ئێمە هێندە منداڵمان بوو، کە هەر زوو ژماردنی ساڵی لەدایکبوونەکانیانمان لێ تێک چوو. ئێمە نوبۆو و شۆژیرو و ئایاکومان بوون. ئێمە (تامێرژی)یمان بوو، کە لەگەڵ براکانماندا دەتگوت سێوێکن و کراون بە دوو لەتەوه و بەختەوەرانە تەماشای ڕووخساریانمان دەکرد. دەمانگوت: *ئۆهـ ئەمە ئێوەن!* ئێمە (ئیکیچی)مان بوو، کە هەر ڕێک لە دراوسێکەمان دەچوو. ئیدی دوای ئەوه، چیدی مێردەکانمان حەزیان نەدەکرد لە نێوچاوانمان بنۆڕن. ئێمە (میسیزو)مان بوو، کە کاتێ لە دایکبوو، ناوکەپەتکی وەک تەسبیح لە ملییەوە ئاڵا و دەمانزانی ڕۆژێک لە ڕۆژان دەبێتە قەشەژن. *دەمانگوت ئەوە ئاماژەیەکە لە بوداوه.* ئێمە (دایسیکو)مان بوو، کە نەرمایی گوێچکەی درێژ و دەمانزانی ڕۆژێک لە ڕۆژان دەوڵەمەند دەبێ. ئێمە (ماسایا) مان بوو، کە بەو دواییيانە، کاتێ تەمەنمان بووبووه چلوپێنج ساڵان، بوومان و ڕێک ئەو کاتە بوومان، کە هەر هەموو ئومێدێکی منداڵخستنەوەمان لەدەست دابوو. یەکێمان دەیگوت: وام زانیبوو دەمێکە دوایین هێلکەم تروکاوه. ئێمە (فوجیکو)مان بوو، کە پێدەچوو یەکەندەردوو دەنگی باوکی بناسێتەوه. *ئاخر کاتێ لە ڕەحمماندا بوون، باوکانیان هەموو شەوێک گۆرانییان بۆ دەکوتن.* ئێمە (یوکیکو)مان بوو، کە ناوەکەی واتە "بەفر" ئێمە هیروکو مان بوو، کە ڕانی قەڵەو و ملی کورت و ڕەنگبێ ئەگەر کوڕ بووایە، باشتر بوو. ئێمە (کامیچیو)مان بوو، کە ئەوەندە ناشرین بوو، دەترساین قەت نەتوانین مێردێکی بۆ

---

* چوار لە بورجەکانی ساڵژمێری چینی.

بدۆزینەوە. *دەموچاوێکی پێوە بوو، شەوقی لە تەپاڵە بڕیبوو.* ئێمە منداڵگەلێکمان بوون دەموچاوێکی وەها جوانیان پێوە بوو، کە بە ئەقڵماندا نەدەچوو لە ئێمە بووبن. ئێمە منداڵگەلێکمان خستنەوە، کە هاوڵاتی ئەمەریکایی بوون و ئێمە هەر بە ڕاستیی دەمانتوانی بە ناوی ئەوانەوە ئەرز بە کرێ بگرین. ئێمە منداڵگەلێکمان خستنەوە کە کۆڵنجیان هەبوو. ئێمە منداڵگەلێکمان خستنەوە کە پێوپلیان گۆج بوو. ئێمە منداڵگەلێکمان خستنەوە کە نەخۆش و شینەهەڵگەڕاو بوون. ئێمە بەبێ دایکانمان منداڵمان بوو، کە ڕێک دەیانزانی دەبێ لە کاتی منداڵبووندا چی بکرێت. ئێمە منداڵگەلێکمان بوو، کە شەش پەنجەیان هەبوو و کاتێک مامانەکان چەقۆکانیان تیژ دەکردەوە، ڕوومان وەرچەرخاند. دەیانگوت: *هەبێ و نەبێ لە کاتی دووگیانییەکەدا قرژاڵت خواردووە.* ئێمە یەکەم شەو لەگەڵ مێردەکانماندا گیرۆدەی ئاتەشەک بووبووین و منداڵەکەشمان بە کوێری لە دایک بوو. ئێمە دووانەمان بوو، ئەوەش شتێک بوو، وەک بەدبەختی تەماشا دەکرا، مامانەکە داوای کرد تەنها یەک دانەیان بهێڵینەوە. دەیگوت: *تۆ خۆت بڕیار بدە، کامیان.* ئێمە یازدە منداڵمان لە ماوەی پازدە ساڵدا بوون، بەڵام تەنها حەوتیانمان بۆ مانەوە. ئێمە بەر لە تەمەنی سیوپێنج ساڵی شەش کوڕ و سێ کچمان بوون، شەوێکیان پاڵێکمان بە مێردەکانمانەوە نا و بەئارامی گوتمان: "دە ئیتر با بەس بێ!" نۆ مانگ دواتر (سویکو)مان بوو، ناوەکەی واتە "دوایەمین" مێردەکانمان دەیانگوت: "دەدەی، یەکێکی تر!" ئێمە بە هەرهەژدە مانگ جارێک و بە شێوەیەکی ڕێکوپێک، پێنج کچ و پێنج کوڕمان بوون، پێنج ساڵ دواتر، ڕۆژێکیان (تویچی)مان بوو، ناوەکەی واتە "یازدە" دەیانگوت: *ئەو واکونی ئیستۆپە.* ئەگەرچی ئاوی ساردمان بە زگماندا ڕشتبوو و چەندین جار لە بەرهەیوانەکەوە بازمان بۆ خوارەوە دابوو، کەچی هەر منداڵمان بوو. یەکێمان دەیگوت: *هەر لەباری دەبەم.* ئێمە منداڵمان بوو، ئەگەرچی ئەو

دەرمانەشمان خواردبوو، کە مامانەکە پێی دابووین تا بەر لە منداڵبوون بگرین. یەکێکمان دەیگوت: *مێردەکەم تووشی هەوکردنی سینگ بووە و ئێشەکەشم وا دەخوازێ لە دەرەوە لە کێڵگە بم.* یەکەمین چوار ساڵی دوای هاوسەرگیریمان منداڵمان نەبوو، ئەوسا قوربانیمان بۆ ئینازی* کرد و شەش کوڕمان یەک لەدوای یەک بوون. ئەوەندە منداڵی زۆرمان بوو، کە ڕەحممان خەریک بوو بەر دەبۆوە و ناچار بووین پشتێنێکی تایبەتی ببەستین، تا ڕەحممان لەناو زگماندا ڕابگرین. ئێمە خەریک بوو منداڵمان دەبوو، بەڵام منداڵەکە لەزگماندا کەوتبوو بە لادا و تاقە شتێک کە هاتە دەرەوە باسکێک بوو. ئێمە بە حاڵ منداڵمان بوو، بەڵام سەری منداڵەکە زۆر گەورە و دوای سێ ڕۆژ لە نقەنق و هێزدانەبەرخۆمان، تەماشای مێردەکانمان کرد و گوتمان: "تکایە، لێم ببوورە!" وامان گوت و مردین. منداڵمان بوو، بەڵام منداڵەکە ئەوەندە لاواز بوو، کە نەیدەتوانی بگری، شەو لە لانکێکدا لەبەر سۆپاکەدا جێمان هێشت. گوتمان ئەگەر تا بەیانی دەرەقەت بێ، ئەوا بەهێزە و دەژی. ئێمە منداڵمان بوو، بەڵام منداڵەکە، کە هەم کچ و هەم کوڕیش بوو، دەستوبرد بە پەرۆ خنکاندمان. منداڵمان بوو، بەڵام قەت شیرمان نەهات و دوای یەک هەفتە مرد. منداڵمان بوو، بەڵام پێشتر منداڵەکە لە ڕەحمماندا مردبوو. هەڵمان گرت و ڕۆیشتین بە ڕووتی لە کێڵگەکە، لای جۆگەلەیەکەوە بە خاکمان سپارد، بەڵام ئەوەندە جێگۆڕکێمان کرد، کە چیدی بیرمان نەدەکەوتەوە لەکوێ بە خاکمان سپاردووە.

---

* Inari: یەکێک لە خواوەندە بنەڕەتییەکانی میتۆلۆژیای شینتۆی ژاپۆنی. خواوەندی دووکیانی و برنج و کشتوکاڵ و ڕێوی و پیشەسازییە.

# منداڵ

بە پارێزەوە دامان نان، لە چاڵی لاڕێ و لە شێوەرد و لە قووڵینەی شاردەدار؛ لەژێر درەختەکاندا دامان نان. لێگەڕاین بە ڕووتی لەسەر بەتانییەکان ڕاکشێین، لەسەر کومباری قوڕچوم لە قەراغی کێڵگەکاندا. لە سندوقی دارینی گەورەی سێودا دامان نان و هەرجارێ لە پاککردنی ڕیزەلۆبیایەک دەبووینەوە، شیرمان دەدان. کە پێڕەوکەبوون و دابین نەدەبوون، جاروبار بە کورسیمانەوە دەبەستنەوە. لە چلەی زستاناندا لە (ڕیدین) بە کۆڵمانەوە گرێمان دەدان و دەچووینە دەرەوە تا مێوەکان ببڕین، بەڵام بەیانیی وا هەبوو، ئەوەندە سارد بوو، کە گوێچکەیان دەیبەست و خوێنیان لێ دەهات. هاوینانێکی زوو لە ستۆکتۆن، لە نزیک چاڵی زێرابەکانەوە دامان دەنان، لە کاتێکدا ئێمە خەریکی پیازهەڵکەندن دەبووین و لە گونییەمان دەنان، دوایی دەکەوتینە لێکردنەوەی نۆبەرەی بەری هەڵوژە. کاتێ دوور دەکەوتینەوە لێیان، چیلکەمان دەدانێ یاریی پێ بکەن. جاروبار بانگمان دەکردن، تا بزانن هێشتا لەو ناوەین. پێمان دەگوتن: *سەگەکان تووڕە مەکەن. دەست لە مەنگەکانەوە مەدەن. دوور مەکەونەوە. ئاخر دوایی بابە تووڕە دەبێ.* بەڵام کاتێ هیلاک دەبوون و بەدواماندا دەگریان، ئێمە هەر لە ئیشەکەمان بەردەوام دەبووین، چونکە دەمانزانی ئەگەر ئیش نەکەین، ئەوا ناتوانین قەرزی کرێی زەوییەکە بدەین. هاوارمان دەکرد: *دایە ناتوانێ بێت.* پاش قەیرێک دەنگیان لاوازتر

و گریانەکەیان نەدەما. لە کۆتاییی ڕۆژ و لە کاتێکدا چ ڕۆشناییەک بە ئاسمانەوە نەدەما، لەو جێگەیەی لێی خەوتبوون، خەبەرمان دەکردنەوە و خۆڵمان لە قژیان دەتەکاند. پێمان دەگوتن: *ئێتر کاتی ئەوەیە بۆ ماڵەوە بگەڕێینەوە.*

هەندێکیان چیکڵدانەگچکە و سەرسەخت بوون و نەیاندەویست گوێ بۆ یەک وشە لەو وشانەی کە دەمانگوت، ڕادێرن. هەندێکیان لە بوداش ئارامتر و بێوەیتر بوون. دەتگوت بە زەردەخەنەوە لە دایک بووبوون. یەکێکیان باوکی لە هەرکەسێکی تر خۆشتر دەویست. یەکێکیان ڕقی لە ڕەنگی تۆخ بوو. یەکێکیان حەزی نەدەکرد بەبێ سەتڵە تەنەکەکەی بۆ هیچ کوێیەک بچێت. یەکێکیان لە تەمەنی سیازدە مانگییدا لەمیانەی ئەوەوە کە پەنجەی بۆ پەرداخێک شیر لەسەر تاقەکە ڕاکێشا، خۆی لە شیری خۆمان بڕییەوە و گوتی: "من حەزم لەوەیە." هەر زۆر لە تەمەنەکەی خۆی ئاقڵتر بوو. *دەستگرەوەکە پێی گوتین، ئەو بە ڕۆحی پیاوێکی پیرەوە لەدایک بووە.* وەک گەورەساڵان لەسەر مێزەکە نانیان دەخوارد. قەت نەدەگریان. قەت نووکەنووکیان نەدەکرد. قەت ئەو چیلکانەی خواردنیان پێ دەخوارد، لە برجەکانیاندا جێیان نەدەهێشت. بێ قرە بەدرێژاییی ڕۆژ بۆ خۆیان یارییان دەکرد، لە کاتێکدا ئێمە لەو نزیکانەوە لە کێڵگەکاندا ئیشمان دەکرد. دەیانتوانی بە سەعات دانیشن و بە قوڕ شت دروست بکەن. کاتێک هەوڵمان دەدا هەڵیان بگرین و بۆ ماڵەوەیان ببەینەوە، ئەوان سەریان ڕادەوەشاند و دەیانگوت: "زۆر قورسم." یان "دایکە، ئیسراحەت بکە!" کە هیلاک دەبووین، بۆمان نیگەران دەبوون. کە غەمبار دەبووین، بۆمان نیگەران دەبوون. بەبێ ئەوەی ئێمە هیچ شتێک بڵێین، ئەوان دەیانزانی ئەژنۆمان دێشێ یاخود لە سووڕی مانگانەداین. شەوانە، وەک تووتکەسەگ لە سەر ئەرزە دارین و بە-کا-پۆشراوەکە لەلای خۆمانەوە دەنوستن؛ لەوەتەی بۆ ئەمەریکا هاتبووین، ئەوە یەکەم

جار بوو کەسێکی تر لامانەوە ڕاکشێت، ترسمان لێ نەنیشێت.

ئێمە هەمیشە شتی لەبەردڵانی خۆمان هەبوون. دەشێ ئەوە (ئیچیرو) ی نۆبەرەمان بووبێ، کە وای لێ کردبین هەر زۆر کەمتر لەچاو جاراندا هەست بە تەنیایی بکەین. یەکێکمان دەیگوت، *مێردەکەم بۆ ماوەی زیاتر لە دوو ساڵ قسەی لەگەڵدا نەکردم.* یان دەشێ ئەوە کوڕی دووەممان، (یویچی) بووبێت، کە لە چوار ساڵیدا خۆی فێری خوێندنەوەی ئینگلیزی کرد. دایکی دەیگوت: *بلیمەتێکە بۆ خۆی.* یان دەشێ ساونوکو بووبێت، کە هەمیشە پەلەپەل دەستی دەگرتین و دەیبردین تا شتێکمان پێ بڵێ، بەڵام بیری دەچۆوە ویستوویەتی چیمان پێ بڵێ. ئێمەش پێمان دەگوت: دەی قەیدی ناکا، دوایی بیرت دەکەوێتەوە. بەڵام قەت قەت بیری نەدەکەوتەوە. هەندێکمان کچەکانمان پێ باشتر بوون، کە هێمن و میهرەبان بوون، هەندێکیشمان کوڕەکانمان پێ باشتر بوون، هەمان شێوەی دایکانمان، کە بەر لە ئێمە کوڕەکانیان پێ باشتر بووە. ئاخر ئەوان قازانجی زۆرتر لە باخەکە بەدەست دەهێنن. خواردنی زیاترمان لە خوشکەکانیان پێ دەدان. کە شەڕیان دەکرد، لەسەریانمان دەکردنەوە. جلکی جوانترمان لەبەر دەکردن. بە هەزار کوللەمەرگی شتێک پارەمان خڕ دەکردەوە و هەر کە تایەکیان لێ دەهات، بۆ لای دوکتۆرمان دەبردن، ئەوە لە کاتێکدا لەماڵەوە خۆمان کچەکانمان چارەسەر دەکردن. ***پلاستەرێکی خەرتەلەم خستە سەر سینگی و لای خودای هەناسەدان و هەلامەت دوعام بۆ کرد.*** ئاخر دەمانزانی کچەکانمان هەمان ئەو ساتەی کە شوو دەکەن، ئیدی دەسبەردارمان دەبن و جێمان دێڵن، بەڵام کاتێ پیر دەبین، کوڕەکانمان ئاگایان لێمان دەبێ.

بەزۆری مێردەکانمان باکیان بە هیچ نەبوو. قەت دایبییەکیان نەدەگۆڕی. قەت قاپێکی پیسیان نەدەشت. قەت دەستیان نەدەدایە گسکێک. ئێواران کە لە کێڵگەوە بۆ ماڵەوە دەگەڕاینەوە، چەندێک ماندوو

و شەکەت بووینایە، بۆ خۆیان دادەنیشتن و ڕۆژنامەیان دەخوێندەوە، ئێمەش شێومان بۆ منداڵەکان لێدەنا و تا درەنگانێکی شەو، قاپمان دەشت و دونیایەک جلکمان دەدووریییەوە. مێردەکانمان لێنەدەگەڕان قەت ئێمە لەپێش ئەوانەوە بنوین. قەت نەیاندەهێشت دوای خۆرهەڵاتن هەستین. دەیانگوت دەبێتە نموونەیەکی خەراپ بۆ منداڵەکان. قەت تەنانەت پێنج دەقیقە پشووشیان پێ نەدەداین. مێردەکانمان پیاوانێکی بێدەنگ و بە-هەتاو-سووتەمەرۆ بوون، تەپەتەپ بە بەدلە قوڕاوییەکانیانەوە بۆ ماڵەوە دەهاتنەوە و دەچوونە دەرەوە و لەبارەی گەشەی ڕەگی چرۆ، نرخی لۆبیای سەوز، سەبارەت بەوەی بلێی ئەمساڵ بتوانین لە زەوییەکە چەند سەبەتە کەرەوز بەرهەم بهێنین، دەیانبۆلاند. بەدەگمەن لەگەڵ منداڵەکانیاندا دەدوان و وا پێدەچوو بەحاڵ بیریان بێتەوە ناویان چییە. *دەیانگوت بە کوڕی ژمارە سێ بڵێ، لاقی بەدوای خۆیدا ڕانەکێشێت.* ئەگەر لەسەر مێزی نانخواردن ببوایەتە شەڕ، دەستیان بەیەکدا دەدا و هاواریان دەکرد: "بەسە!" منداڵەکانیش بە نۆرەی خۆیان هەر هیچ حەزیان نەدەکرد قسە لەگەڵ باوکانیاندا بکەن. هەر کە یەکێکیان شتێکی دەبوو بیڵێ، بە ئێمەی دەگوت پێیان بڵێین. *دەیانگوت: بە باوکم بڵێ پێویستم بە دراوێکە. بە باوکم بڵێ یەکێک لە ئەسپەکان شتێکییەتی. بە باوکم بڵێ کاتێ ڕیشی تاشیوە، شوێنێکی بیر چووە. لە باوکم بپرسە چۆنە ئاوها پیرە.*

هەرچی زووتر توانیمان منداڵەکانمان لە کێڵگەکاندا بخەینە بەر ئیش. لەگەڵماندا لە (سان مارتین) شلیکیان کۆ دەکردەوە. لە لوس ئوسوس بەزالیایان لەگەڵ لێدەکردینەوە. لە هوگسون و (دیل ڕای)، لە کاتێکدا ئێمە تریمان دەڕنی و لەسەر سینیی تەختە دامان دەنا تا لەبەر هەتاودا وشک ببێتەوە، ئەوان لەدوامانەوە دزەیان دەکردە ڕەزەکانەوە. بە سەتڵ ئاویان دەر دەهێنا. فلچەکانیان پاک دەکردنەوە. گۆزگیاکانیان دەماڵی.

داریـان دەبڕییـەوە. لـەو گەرمـا هەڵپڕوکێنـەرەی هاوینـی ئیمپریـال ڤالـی و بـەر لـەوەی ئێسـکەپەیکەریان بەپێـی پێویسـت گەشـەی کردبـێ، ئەرزیـان دەکێڵا. هەندێکیان خاووخلیچک و خەواڵوو دەجووڵان و بە هەڵە شـەتڵی قەرنابیتیان بە هەڵاوگێڕاوی دەڕواند. هەندێکی تریان خێراتر لە خێراترین هێزی بە کرێگرتەی کار، تەماتەیان بژار دەکرد. زۆربەیان نووکەنووکیان دەکـرد، زگیـان دەئێشـا، ژانەسـەریان لەگـەڵ بـوو. چاوانیـان شـێتانە بـە تەپوتۆز دەبرژایەوە. هەندێکیان هەموو بەیانییەک جزمەیان لەپێ دەکرد، بەبـێ ئـەوەی بـۆ ئیش بانـگ بکرێن. یەکێکیـان مەقەسـتێکی لەبەردڵانـی ڕووەکبڕینـی هەبوو، کـە هەمـوو ئێوارەیـەک دوای نانخـواردن لـە کادانەکـە تیـژی دەکـردەوە و نەیدەهێشـت جگـە لـە خـۆی، کەسـی تـر پەنجـەی بـۆ ببات. یەکێکیـان نەیدەتوانـی مێشـومەگەز لـە خەیاڵـی وەدەر نێت. دەیگـوت: *لـە هەمـوو شـوێنێکن.* یەکێکیـان ڕۆژێکیـان لـە ناوەڕاسـتی کێڵگەیەکـی پیـازدا دانیشـت و گوتـی، حـەزی دەکـرد قـەت لەدایـک نەبووایـە. ئێمـەش دەمانویسـت بزانیـن ئاخـۆ شـتێکی باشـمان کـردووە کە ئەوانمـان هێناونەتـە ئـەم دونیایـەوە. ئاخـر قـەت پارەی تەواومـان پێ نەبـووە کـە بتوانیـن تاقـە یارییەکـی منداڵانیـان بـۆ بکڕیـن.

بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا، بـە سـەعات وەک کارژۆڵـە لـە دەرەوە لـە کێڵگەکانـدا یارییان دەکـرد. شمشـێریان لـە دارمێوی شـکاو دروسـت دەکرد و لەژێـر درەختەکانـدا شـەڕەشـیریان دەکـرد. کۆلارەیـان لـە ڕۆژنامـە و داربالسـە* دروسـت دەکـرد و چەقۆیـان لـە پەتەکانـی دەبەسـت و کـە بـا هەڵی دەکرد، شـەڕەکۆلارەیان دەکرد. بوکیان لە تـەل و قامیش دروسـت دەکـرد و لـە دارسـتانەکەدا بـە چۆپسـتیک** شـتی خەراپیـان لـەو بووکانـە دەکرد. کاتێ مانـگ تریفـەی دەدا، گەمـەی (سـێبەر، سـێبەر ڕاودەنێ)یان لـە

* Balsaträ: درەختێکی ڕەق و سووکەڵەیە و کەڵەکی لێ دروست دەکرێت.
** ätpinner: ئەو دوو چیلکەیەی کە ژاپۆنییەکان خواردنی پێ دەخۆن.

حەوشـە دەکـرد، ڕێـک وەک ئـەوەی ئێمـە لـە ماڵـەوە، لـە ژاپـۆن دەمانکـرد. ئـەوان گـەمـەی (شـەق-لـە-قووتوودان) و (مومبلیتـی - پیـگ) یـان بـە قەڵەمبڕ و گـەمـەی (جـان کیـن پـۆ)یـان دەکـرد. ئـەوان پێشـبڕکێی ئەوەیـان دەکـرد، کـە کامیـان شـەوی پێش چوونمـان بـۆ بـازاڕ، دەتوانـێ زۆرتریـن سـندوق دروسـت بـکا و کامیـان دەتوانـێ زۆرتریـن کات بـە دارگوێزەکـەوە خـۆی شـۆڕ بکاتـەوە، بەبـێ ئـەوەی بـەری بـدات. کاغەزەکانیـان قـەد دەکـردن و دەیانکـردنە فڕۆکە و تەیر و هەڵیان دەفڕاندن و تەماشایان دەکردن. هێلانەی قەلەباچکـە و کاژی مـار و توێکڵـی قالۆنچـە و گزگلـی سـنەوبەر و بۆریـی ژەنگاویـی ئاسـنیان لـە خـوار ناوچـەی هێڵـی ئاسـنەکەوە کـۆ دەکردنـەوە. خۆیـان فێری نـاوی کەوکەبـەکان کردبوو. دەسـتی یەکترییـان دەخوێندەوە. *یەکێکیـان بـەوی تریانـی دەگـوت: ئـەم هێڵـی ژیانـە، بـە شـێوەیەکی نائاسـایی کورتـە.* پێشـبینییان بـۆ یـەک دەکـرد. ئەمیـان بەویانـی دەگـوت: *ڕۆژێـک لـە ڕۆژان بـە قەتـار سـەفەرێکی درێـژ دەکەیـت.* دوای شـێوکردن، بـە چـرا نەوتییەکانیانـەوە دەچوونـە کادانەکـە و گـەمـەی (دایـە و بابـە لـە سـەرەوە لـە بەرهەیوانەکەن)یـان دەکـرد. *یەکیـان بەویانـی دەگـوت، ئێسـتا لـە زگـی خـۆت بـدە و وا بنوێنـە* خەریکیت دەمریت. شـەوانی هاوینیش کاتـێ پلـەی گەرمـا دەگەییشـتە سـیوپێنج، بەتانییەکانیان لـە دەرەوە، لەژێر دارقوخەکەدا ڕادەخسـتن و خەونیان بـە سـەیرانێکەوە لـە خـوارەوە، لـە گـوێ ڕووبارەکـە دەبینـی، خەونیـان بـە لاسـتیکێکی نوێـی خەتکوژانـەوەوە، بـە کتێبێـک، تۆپێـک، بوکەشووشـەیەکی فەخفووریـی بـە چاوانێکـی درەوشـاوەی شـینی مەیلـەو وەنەوشـەییەوە دەبینـی. خەونیان بـە ڕۆژێکـەوە دەبینـی، کـە لـە ماڵـەوە دەر بچـن، خەونیـان بـە جیهانـە گەورەکـەی دەرەوە دەبینـی.

ئـەوان بیسـتبوویان لـە دەرەوەی مـاڵ، منداڵانـی سـەیر و ڕەنگپەڕیو هەن، کـە تـەواو تـەواو لەنـاو ماڵدا گـەورە بـوون و هیـچ شـتێک لەبـارەی کێڵگـە و جۆگەلەکانـەوە نازانـن. بیسـتبوویان هەندێـک لـەو منداڵانـە، تەنانـەت هەرگیز

درەختێکیشیان نەبینیوە. دەیانگوت: دایکی ئەو منداڵانە ناهێڵن منداڵەکانیان بچەنە درێ و لەبەر هەتاودا یاری بکەن. بیستبوویان لە دەرەوەی ماڵەکانیان، خانووی سپیی شکۆدار هەن، بە ئاوێنەی ئاڵتوونی و دەرگەی کریستاڵ و تەوالێتی فەخفوورییەوە، کە ئەگەر بنیادەم زنجیرێک ڕاکێشێت، ئەوا ئاو بە کونجەکەیدا دەڕوا. *هەر هیچ بۆنیان لێ نایەت*. بیستبوویان لە دەرەوەی حەوشەکانەوە دۆشەکگەلێک هەن، کە پەڕی ڕەقی میتاڵیان تێ ئاخنراوە و بە جۆرێک لە جۆرەکان وەک هەور نەرمن (خوشکی "گورو" وەک کارەکەر لە شار ئیش دەکا و کاتێ گەڕاوەتەوە، گوتوویەتی تەختەخەوەکان ئەوەندە نەرم بوون، کە ناچار بووە لەسەر ئەرزەکە بنوێ.) ئەوان بیستبوویان دوور لە ماڵەکانیانەوە، دایکانێک هەن هەموو بەیانییەک بەرچایی لە نوێنەکانیاندا دەکەن، باوکانێک کە بەدرێژاییی ڕۆژ لەسەر کورسیی تێئاخنراو دادەنیشن و بە تەلەفونێک قیژەقیژ داوای شت دەکەن - بەرامبەر ئەوە هەقدەست وەردەگرن. منداڵەکان بیستبوویان کە لە دەرەوەی ماڵەکانیان، بۆ هەرکوێیەک بچن، هەر غەریبن، ئەگەر بنیادەم بە هەڵە سوار پاسێکی هەڵە ببێت، ئەوا دەشێ قەت هەمدیس ماڵەوەی بۆ نەدۆزرێتەوە.

ئەوان سەرەمێکوتە و پووشکەبەقوونەیان لە خوارەوە لای جۆگەکەوە دەگرت و دەیانکردنە قووتووی شووشەوە. کە مریشکمان سەر دەبڕین، تەماشایان دەکرد. ئەو جێگەیانەیان لە سەرەوە، لە چیاکە دەدۆزینەوە، کە تازەکی کەڵەکێوییەکانی لێ نوستبوون و لەسەر لانە خڕەکانیان لەنێو تۆپەڵە گژوگیا بە-ئەرزەوە-پانبووەوەکەدا ڕادەکشان. کلکی مارمێلکەکانیان دەبڕی، تا بزانن بە چەندێک کلکیان لێ دەڕوێتەوە. *هەر هیچ لێیان نەدەڕوایەوە*. ئەو زەڕنەقووتانەیان دەبردنەوە ماڵەوە، کە لەسەر درەختەکان دەکەوتنە خوارەوە و بە چیلکەی دران، پرپۆڵەی شیرینی برنجیان دەرخوارد دەدان، بەڵام کاتێ بۆ سبەی بەیانی لە خەو

هەڵدەسان، دەیانبینی مردار بوونەتەوە. ئێمە قسەمان بۆ دەکردن، کە سروشت باکی بەوە نییە. لەسەر حەسارەکە دادەنیشتن و تەماشایان دەکرد چۆن جووتیاری کێڵگەیەکی ئەو نزیکانە، مانگاکەی هێناوەتە پێشەوە، تا بە کەڵەکەی بگەیەنێ. پشیلەیەکی دایکەیان دەبینی، کە بێچووەکانی خۆی دەخوارد. ئێمە بۆمان ڕوون دەکردنەوە شتی *وا ڕوو دەدا*. ئەوان دەیانبیست چۆن ئێمە شەوانێکی درەنگ مێردەکانمان سوارمان دەبوون و ئەگەرچی دەمێک بوو جوانیمان بزر کردبوو، کەچی دەستیان لە بەرۆکمان بەر نەدەدا. گوێمان لێ بوو پێیان دەگوتین: چ گرینگ نییە لە تاریکییدا چۆن دەنوێنیت. هەموو شەوێک لەگەڵماندا، لە دەرەوە، لە بەرمیلی گەورەی داردا، کە بە ئاگر گەرم دەکرا، خۆیان دەشت و تا چەناگەیان ڕۆ دەبردە ئاوە لەکوڵەکەوە و سەریان بۆ دواوە دەچەمانەوە. چاوانیان لێک دەنا. خۆیان بەدوای دەستماندا درێژ دەکرد. پرسیاریان لێ دەکردین: *بنیادەم چۆن بزانێ مردووە؟ بیر بکەوە، ئەگەر باڵندە نەبووایە؟ بیر بکەوە، ئەگەر خاڵی سوور بەسەر جەستەی مرۆڤەوە هەبووایە، بەڵام هەر هیچ ئازاری نەهاتایە؟ ئایا ڕاستە چینییەکان هەر بەڕاستی قاچوقوولی بەراز دەخۆن؟*

ئەوان شتگەلێکیان هەبوون، کە دڵنیاییان پێ دەبەخشین. سەرەسۆدەیەکی سوور. هەڵماتێک. پۆستکارتێک، وێنەی دوو خانمی شۆخی ڕووسی تێدا بوو، کە بە گوێ ڕووباری سۆنگهاوادا پیاسەیان دەکرد و خاڵۆیەکیان بۆی هەناردبوون، کە لە مانچوریێت باروبنەی خستبوو. ئەوان پەڕگەلی سپیی بەختیان هەبوو، کە هەمیشە لە گیرفانەکانیاندا بوو، هەروەها بەردگەل، کە لە پەڕۆی نەرمەوە پێچرابوون و لە چەکمەجەی مێزەکاندا دەریان هێنابوون و بە دەستیانەوە بوو – تەنها ساتێکی کەم، تا ئەو هەستە ناخۆشەیان تێدەپەڕی. ئەوان وشەگەلی نهێنییان هەبوون، هەر کە ترس دای دەگرتن، لەبەر خۆیانەوە دەیانگوت. ئەوان

درەختگەلی خۆیان هەبوون، کە هەر حەزیان بکردایە تەنیا بن، پیایاندا هەڵدەزنان. *دەیانگوت: بێزەحمەت هەر هەمووتان لێرە بڕۆن.* ئەوان خوشکانی خۆشەویستی خۆیان هەبوون، کە دەسبەجێ لە باوەشیاندا خەویان لێ دەکەوت. ئەوان برای بەتەمەنتریان هەبوون، کە ڕقیان لێیان و حەزیان نەدەکرد لە ژوورێکدا بەتەنها لەگەڵیاندا جێیان بهێڵین. دەیانگوت: *دەمانکوژن!* ئەوان سەگەلێکیان هەبوون، کە هەمیشە لەگەڵیاندا بوون و شتگەلێکیان بۆ دەگێڕانەوە، کە بۆ کەسی تریان نەدەگێڕانەوە. *دەیانگوت: پایپەکەی باوکم شکاندووە و لەژێر درەختێکدا لە چاڵم ناوە.* ئەوان یاسا و ڕێسای خۆیان هەبوون. لەوانە: قەت مەنو و سەرینەکەت ڕووەو باکوور بێت (هوشینکۆ بە سەرینی ڕووە و باکوورەوە نوستووە، نیوەشەو هەناسەی لەبەر بڕاوە و مردووە). ئەوان ڕیتواڵی خۆیان هەبوو: *بنیادەم دەبێ هەمیشە خوێ بکا بەو شوێنەدا، کە گەڕۆکێکی لێ بووە.* ئەوان قەناعەتگەلی خۆیان هەبوون: *ئەگەر جاڵجاڵۆکەیەکت لە بەیانیاندا بینی، ئەوە نیشانەی بەختە. ئەگەر دوای نانخواردن بنویت، ئەوا دەبیتە مانگا. ئەگەر زەمیلەیەک بنێیتە سەر سەرت، ئەوا چیدی گەورە نابیت. گوڵێکی تەنها: واتە مردن.*

ئێمە حەکایەتمان لەبارەی چۆلەکەی زمانقرتاو و قوڵینگی شوکرانەبژێر و ئەو بێچووە کۆترانەوە بۆ دەگێڕانەوە، کە هەمیشە لێدەگەڕێن دایکان و باوکانیان لەسەر بەرزترین پەلک بنیشن. هەوڵمان دەدا فێریان بکەین چۆن ڕەفتار بکەن. دەمانگوت: *قەت بە چیلکەی نانخواردنەکەتان ئیشارەت مەکەن. قەت چیلکەی نانخواردنەکەتان مەمژن. قەت دوایین پارووی خواردنەکەتان لە قاپەکەدا مەخۆن.* کە بەرامبەر خەڵکی تر میهرەبان دەبوون، ستایشمان دەکردن، بەڵام پێمان دەگوتن قەت بەرامبەر کارە باشەکانتان چاوەڕێی هیچ جۆرە پاداشتێک مەبن. هەر کە هەوڵیان دەدا لە دژمان بوەستن، لەگەڵیاندا بەشەڕ دەهاتین. فێرمان دەکردن قەت هیچ

سوالانەیەک وەرنەگرن. فێرمان دەکردن قەت خۆیان هەڵنەکێشن. هەموو ئەو شتانەمان فێر دەکردن، کە خۆمان دەمانزانین: سەروەت و سامان لە سەنتێکەوە دەست پێ دەکا. باشترە تووشی گێچەڵ بێیت، وەک لەوەی خەراپ مامەڵە بکەیت. پێویستە هەر هەموو ئەو شتانە بدەیتەوە، کە پێت دەدرێن. وەک ئەمەریکاییەکان بە دەنگی زل قسە مەکەن. خۆتان لە چینییەکان دوور بخەنەوە؛ ئەوان ئێمەیان خۆش ناوێن. ئاگاتان لە کۆرییەکان بێت، ئەوان ڕقیان لێمانە. خۆتان لە فیلیپینییەکان بپارێزن؛ ئەوان لە کۆرییەکان خەراپترن. قەت ژن لە خەڵکی ئوکیناوا مەهێنن؛ ئەوانە ژاپۆنیی ڕەسەن نین.

بەتایبەتی بەزۆری زوو زوو لە گوند لەدەستمان دەچوون. بە مەلاریا و سوورێژە. بە ملەخڕێ. بە کۆکەڕەشە. بە هەوکردنی سەیر، کە لە شەودا دەتەنییەوە و دەبووە گانگرین. یەکێکیان ڕەشەجاڵجاڵۆکەیەکی ژەهراوی لە دەرەوە پێوەی داو تای لێ هات. یەکێکیان هێسترە ڕەساسییە نازدارەکەمان جووتەی لە زگی دا. یەکێکیان دیار نەما، لە کاتێکدا ئێمە قۆخمان لە هۆدەی بەستەبەندیدا بژار دەکرد، ئەگەرچی ژێر بەردبەبەرد و درەختبەدرەختی بەدوادا گەڕاین، بەڵام ڕەشە ڕاهات و قەت نەماندۆزییەوە، ئیدی پاش ئەوە هەرگیز ئەو کەسەی جاران نەماین. *ئارەزووی ژیانمان لەدەست دا.* یەکێکیان کاتێ ڕێواسمان بۆ بازاڕ دەبرد، لە لۆرییەکەوە کەوتە خوارەوە، پاشان چووە دۆخێکی بێهۆشییەوە، کە قەت لێی وەئاگا نەهاتەوە. یەکێکیان لەلایەن هەرمێرنێکەوە لە بێستانێکی ئەو نزیکانەدا بە بارمتە گیرا. پیاوێک بە بارمتەی گرتبوو، کە چەندین جار دەستمان بە ڕوویەوە نابوو. ئای ئەگەر پێم گوتبا باشە. یەکێکیان بەسەختی سووتا، کاتێک ئامێری بادەدروستکردنەکە لەودیو کادانەکەوە تەقیبۆوە و تەنها یەک ڕۆژ ژیا. *دوایین قسەی کە پێی گوتم ئەمە بوو: دایکە، بیرت نەچێ تەماشای ئاسمان بکەیت!* ژمارەیەکیان

خنکان. یەکێکیان لە رووباری کالڤێرا دا؛ یەکێکیان لە ناچیمینتو؛ یەکێکیان لە کەناڵێکی ئاودێریدا؛ یەکێکیان لە لەگەنێکی خۆشووشتندا، کە دەمانزانی نەدەبوو شەو لە دەرەوە بەجێی بهێڵین. لە مانگی ئابی هەموو ساڵێکدا، لە ئاهەنگی مردووەکاندا، چرای سپیی کاغەزمان لەسەر گۆڕەکانیان دادەگیرساندن و بەخێرهاتنەوەی گەڕانەوەی رۆحیانمان بۆ تاقە رۆژێک دەکرد. لە کۆتاییی رۆژدا و کاتێک وەختی ئەوە دەهات جێمان بهێڵن، چرا کاغەزییەکانمان دەخستنە رووبارەکەوە، تا هەمدیس خاترجەم ماڵەوە بدۆزنەوە. لەبەر ئەوەی ئێستا ئەوان بوداگەل بوون، کە لە نیشتمانی بەختەوەراندا دەژیان.

هەندێکمان منداڵمان نەدەبوو، ئەوەش لە هەموو قەدەرەکان ناخۆشتر بوو. لەبەر ئەوەی بەبێ میراتگرێک، کە دەکرا ناوی بنەماڵەکەمان بەزیندوویتی رابگرێ، چیدی رۆحی باووباپیرانمان لە بووندا نەدەما. یەکێکمان دەیگوت: ***ئەمە وەک ئەوە وایە، کە من هەر وا لە هەواتتە ئەو هەموو رێگەیەم بەرەو ئەمەریکا بڕیبێ.*** جاروبار هەوڵمان دەدا بۆ لای چارەسەرکارێک بچین و ئەویش پێی دەگوتین رەحممان بە هەڵە دروستبووە و ناتوانن هیچمان بۆ بکەن. دەیانگوت: *تازە خواوەندەکان بڕیاریان لە چارەنووستان داوە.* وایان پێ دەگوتین و پاشان بەرێیان دەکردین. یان راوێژمان بە دوکتۆر ئیشیدای نۆژداری سوژنی دەکرد، ئەویش سەرنجێکی دەداین و دەیگوت: "یانگی زۆرتان هەیە." وای دەگوت و گژوگیای پێ دەداین، تا هێز بداتە (یین*) و خوێنمان. سێ مانگ دواتر،

---

* Yin 陰، yang 陽: چەمکێکی سێنتراڵە لە فەلسەفەی چینییدا، کە ئاماژەیە بۆ کردنی شتەکان. یین و یانگ دوو توخمی گەردوونن. یین: توخمە رەش، ژنانە و ناچالاکەکەیە. ئاماژەی زەوی و مانگ، رەش و سارد و شێدار، بەڵام هەروەها چیا و ئێسکەپەیکەریشە. دەگوترێ پڵنگ ئەو بوونەوەرەیە، کە لەهەر شتێکی تر زیاتر "یین"ی تێدا بەرجەستە دەبێ. "یانگ"یش توخمە پیاوانە و سپی و چالاکەکەیە. ئاماژەی ئاسمان و خۆر و رووناکی و گەرمی و وشکییە. دەگوترێ هەژدیها ئەو بوونەوەرەیە، کە لە هەر

منداڵێکی ترمان لەبار دەچوو. هەندێ جار مێردەکانمان بۆ ماڵەوە، بۆ ژاپۆنیان دەناردینەوە و لەوێ قسەوقسەڵۆکەکان تا ئەودوای ژیانمان، هەر بە قونمانەوە دەبوون و لێمان نەدەبوونەوە. دراوسێکان چپەچپ دەیانگوت: "تەڵاقدراو!" یان دەیانگوت: "بیستوومانە وەک کوولەکەی درێژ، وشکە!" هەندێک جار پرچمان دەبڕی و دەمانبەخشییە خواوەندی پیت. ئاخر تەنها ئەو بوو دووگیانی دەکردین، بەڵام هەموو جارێک دەکەوتینە سووڕی مانگانەوە. ئەگەرچی مێردەکانمان پێیان دەگوتین چ بەلایانەوە گرینگ نییە ببنە باوک یان نا - پێیان دەگوتین تاقە شتێک ئومێدی پێ بخوازن، ئەوەیە کە لەپاڵماندا پیر ببن - بەڵام نەماندەتوانی بیر لەو منداڵانە نەکەینەوە، کە قەت قەت نەماندەبوون. *هەموو ئێوارەیەک گوێم لێیان دەبوو، کە لەسەر درەختەکان، لەودیو پەنجەرەکەمەوە یارییان دەکرد.* یەکێکمان وای دەگوت.

منداڵەکان لە گەڕەکە ژاپۆنی نشینەکاندا لەگەڵماندا دەژیان، هەر- هەشت نۆ کەسێک لە ژوورێکدا، لەودیو دوکانی سەرتاشین و مەلەگە و لەباڵەخانەی بچووکی بۆیەنەکراودا، کە هێند تاریک بوون، ناچار بووین بەدرێژایی ڕۆژ گڵۆپیان تێدا هەڵبکەین. ئەوان لە ڕێستۆرانەکانماندا گێزەریان بۆ پاک دەکردین. سێویان لەسەر تەختەی میوەکانمان بۆ کۆمەڵ دەکردین. خۆیان هەڵدەدایە سەر پاسکیلەکانیان و کیسەخۆراکیان بۆ دەرگەی موبەقی مشتەرییەکانمان دەگواستەوە. لە ژێرزەمینەکانی جلکشۆرییدا جلکی ڕەنگاوڕەنگیان لە سپی جیا دەکردەوە و خێرا خۆیان فێر دەکرد، کە پەڵەی سووری شەراب لە پەڵەی خوێن جیا بکەنەوە. زەوی پانسیۆنەکانمانیان گسک دەدان. خاولییەکانیان دەگۆڕین.

بوونەوەێکی تر زیاتر بەرجەستەکەری "یانگ"ە. بە گوێرەی ئەو چەمکە، بازنەی دەرەوە "هەموو شت" دەگرێتەوە، بەڵام سپی و ڕەش لەنێو بازنەکەدا، یەکانگیربوونی دوو وزەی دژ بە یەک دەگرێتەوە، وزەی ڕەشی "یین" و وزەی سپیی "یانگ" ئەو دوو وزەیەی کە دروستبوونی هەموو شتێک لە ژیاندا پێکدێنن. و.ک.

سەرچەفەکانیان دەگۆڕین. جێگەخەوەکەیان ڕادەخست. دەرگەیان لەسەر شتگەلێک دەکردنەوە، کە قەت نەدەبوو بیانبینییان. *وام زانی ڕاکشاوە و نوێژ دەکا، بەلام مردبوو.* هەموو ئێوارەیەک نانی ئێوارەیان بۆ بێوەژنە پیرەکەی چوار A، خاتوو کاوامورای خەلکی ناگاساکی دەبرد، کە وەک کارەکەر لە هۆتێلی درێکسیل ئیشی کردبوو و چ منداڵیشی نەبوو. دەیگوت: مێردەکەم قومارچی بووە و بە تاقە چلوپێنج سێنتەوە جێی هێشتم. ئەوان قوماری " گۆ"یان لە لوبین لەگەل میستەر موریتای ڕەبەندا دەکرد، کە لە سی ساڵ لەوەوبەرەوە لە (ئیمپرێس هاند لاوندرای) بووبووە ئووتووچی و تا ئەمڕۆش هەر وەک ئووتووچی کاری دەکرد. هەر هەموو شتێک بەخێرایی تێدەپەڕی. دوای باوکانیان لە بێستانێکەوە بۆ بێستانێکی تر دەکەوتن و خۆیان فێر دەکرد پەرژین بقرتێنن و گیا ببڕن. تا ئێمە لە گسکدانی ماڵەکانی ئەوبەر شەقامەکە دەبووینەوە، ئەوان لە پارکەکەدا لەسەر سەکۆی دارین دادەنیشتن. پێمان دەگوتن: *لەگەل خەلکی غەریبەدا قسە مەکەن. لە قوتابخانە زیرەک بن. بەسەبر بن. هەرچییەک دەکەن، وەک ئێمە مەبن.*

لە قوتابخانە، لەدوای دواوە و بە جلکە- لە-ماڵ-دووراوەکانیانەوە لەگەل مەکسیکییەکاندا دادەنیشتن و بە دەنگێکی شەرمن و لاڵەپەتە دەپەیڤین. قەت دەستیان هەڵنەدەبڕی. قەت زەردەخەنەیان نەدەکرد. لە پشووەکاندا لە قوژبنێکی حەوشەی قوتابخانەدا کروشکەیان دەکرد و لەناو خۆیاندا بەو زوبانە نهێنییە، لە جێگەی شەرمەزارییەکەیان چپەچپیان دەکرد. لە کافتریاکاندا هەمیشە لەدوای دواوەی ڕیزی نانی نیوەڕۆدا ڕادەوەستان. هەندێکیان – نۆبەرەکانمان – هەر هیچ ئینگلیزییان نەدەزانی و کە داوایان لێ دەکرا شتێک بە ئینگلیزی بڵێن، ئەژنۆیان دەکەوتە لەرزین. کاتێ مامۆستاکەیان لە یەکێکیانی دەپرسی ناوت چییە، وەلامی دەدایەوە: "شەش" ئەوسا قاقای پێکەنین تا چەند ڕۆژێک لە گوێیدا

دەنگی دەدایەوە. یەکێکی تریان گوتبووی ناوی "مێز"ە و ئیدی ئەو ناوەی تا کۆتاییی ژیانی پێوە لکا. زوربەیان دەستەودامێنمان دەبوون، کە بۆ قوتابخانەیان نەنێرینەوە، بەلاّم بۆ ماوەی تەنها چەند هەفتەیەک خۆیان فێری هەر هەموو ناوی ئاژەلاّن بە ئینگلیزی کرد و دەیانتوانی بە دەنگی بەرز ناوی هەموو تابلۆی شەقامەکان، کە کاتێک لە خوارەوە لە ناوەندی شار دەبووین و بازاڕمان دەکرد، بخوێننەوە - دەیانگوت ئەو جادەیەی کۆلاّنەی بڕەداری بەرزی لێیە، ناوی (ستەیت ستریت)ە و ئەو جادەیەش کە سەرتاشە سەیروسەمەرەکانی لێن، ناوی (گروڤ)ە، ئەو پردەش کە میستەر ئیتامی خۆی لێوە هەلّدا، کاتێ پشکی بازاڕ داڕووخا، ناوی پردی (لاست چانس)ە - و بۆ هەرکوێیەک دەچوون، دەیانتوانی داوای ئەو شتە بکەن، کە دەیانویست. *خواردنەوەیەکی چوکولات، سوپاس.*

یەک لەدوای یەک ئەو وشە کۆنانە لە سەریان چوونە دەرەوە، کە ئێمە فێرمان کردبوون. ناوی گولّیان بە ژاپۆنی بیر چووەوە. ناوی ڕەنگەکانیان بیر چووەوە. ناوی خواوەندی ڕێوی و خواوەندی بروسکە و خواوەندی هەژارییان بیر چووەوە، ئەو ناوانەیان بیر چوونەوە، کە ئێمە قەت قەت نەمانتوانیبوو دەسبەرداریان ببین. دەمانگوت: *چەندێک لەم ولاّتەدا بژین، ئەوانە لێناگەڕێن زەوی بکڕین.* ناوی میزوگامی، خواوەندی ئاویان بیر چووبۆوە، کە پەیامی بە ڕووبار و جۆگەلەکانمان دەدا و ئێمەشی هان دەدا چالاّوەکانمان بە پاکوخاوێنی ڕابگرین. ناوی ڕووناکیی بەفر و سیسرک و شەوانە ڕەڤینیان بیر چووبووەوە. بیریان چووبۆوە دەبێ لەبەر میحرابەکەدا چی بە باووباپیرە مردووەکانمان، کە شەو و ڕۆژ ئێشکیان بەدیارەوە گرتبووین، بلّێن. بیریان چووبووەوە چۆن شت دەژمێرن. دوعاکانمانیان بیر چووبوونەوە. هەر هەموو ڕۆژەکانیان تەرخان دەکردن بۆ ئەوەی لە زوبانە تازەکەیاندا بژین، ئەگەرچی سالاّنێکی زۆر بوو لە ئەمەریکا دەژیاین، کەچی هێشتا سەرمان بە بیستوشەش

پیتەکەی ئەو زوبانە گێژی دەخوارد. یەکێکمان دەیگوت: *تاقە شتێک فێری بووم، پیتی(X)بوو، تا بتوانم ناوی خۆم لە بانق بنووسم.* ئەوان چ زەحمەتییەکیان نەبوو کە (ا) و (ر)ەکانی خۆیان بنووسن. تەنانەت کە ڕۆژانی شەممەش هەناردمانن بۆ کڵێسای بوداییەکان تا ژاپۆنی بخوێنن، یەک تۆزقاڵ فێر نەبوون. یەکێکمان دەیگوت: *تاقە پاساوێک کە منداڵەکانم بچن بۆ ئەوێ، ئەوە بوو تا لەکۆڵ کارکردن لە دوکان ببنەوە.* بەڵام کاتێ گوێمان لێیان بوو بەدەم خەوەوە بە دەنگی بەرز دەدوان، ئەو وشانەی کە لە زاریان دەهاتنە دەرەوە، ژاپۆنی بوون. سوێند دەخۆین و دڵنیاین کە هەر بەڕاستیی وشەی ژاپۆنی بوون.

ئەوان ناوی تریان بۆ خۆیان هەڵدەبژارد، کە باو بوون و ئێمە لێمان نەنابوون. یەکێکیان ناوی خۆی نابوو دۆریس. یەکێکی تر ناوی خۆی نابوو پێگی. زۆریان ناوی خۆیان نابوو جۆرج. ئەوانی تر (سابورۆ)یان بە گولین بانگ دەکرد، لەبەر ئەوەی ڕێک لە چینی دەچوو. توهیتاچی بە هارلم بانگ دەکرا، لەبەر ئەوەی پێستی هەر زۆر ڕەش بوو. ئیتسوکو لە یەکەمین ڕۆژی قوتابخانەیدا، لەلایەن میستەر سلاتەری مامۆستایەوە، ناو نرا ئێستەر. دەیگوت: "ئەوە ناوی دایکی مامۆستاکەمە." ئێمەش وەڵاممان دایەوە: "هەروەها ناوی تۆیشە." سومیرا ناوی خۆی نا ڤیۆلیت. شیزوکو بووبووە سوگەر. ماکوتو بووبووە (ماک)ێکی ڕووت. شیگارو تاگاکی کاتێ تەمەنی نۆ ساڵان بوو، بە کڵێسای باپتیستەوە پەیوەست و ناوی خۆی بۆ پاول گۆڕی. ئێدیسون کوبایاشی هەر لە منداڵییەوە تەمبەڵ و تەوەزەل بوو، بەڵام خاوەن زەینێکی فۆتۆگرافییانە بوو، ناوی هەموو ئەو کەسانەی دەزانین، کە جارێک لە جاران بینیبوونی. گراسی سوگیتا حەزی لە دۆندرمە نەبوو. دەیگوت زۆر ساردە. کیتی ماتسوتارۆ چاوەڕێی هیچ لە کەس و هیچیشی بە کەس نەدەدا. تینی هۆندای مەتر و نەوەد سانتیم درێژ و درێژترین ژاپۆنی بوو، کە ڕۆژێک لە ڕۆژان

بینیبوومان. موپ یاماساکی خاوەن قژێکی درێژ و حەزی دەکرد وەک کچ جلک بپۆشێ. لەفتی هایاشی لە ئیمیرسون جونیور هایک ئەستێرە بوو. سام نیچیمورا بۆ تۆکیۆ هەنێردرایەوە، تا ژاپۆنییەکی تەواو بخوێنێ و هەر ڕێک دوای شەش ساڵ و نیو، بۆ ئەمەریکا گەڕایەوە. لەوێ ناچاریان کردبوو دووبارە لە پۆلی یەکەوە تێ هەڵبچێتەوە. دایسی تاکادا ئاکاری باش و حەزی دەکرد شت بە گرووپی چوار کەسی بکا. باوکی مابەل ئوتا سێ جاران نابووت بووبوو. خێزانەکەی لیستەر ناکانو هەموو جلکەکانیان لە گودویل دەکڕین. دایکی تومی تاکایاما – هەمووان ئەوەیان دەزانی – قەحبە بوو. ئەو شەش منداڵی جیاوازی لە شەش پیاوی جیاواز هەبوون و دووانیشیان جمک بوون.

تا ڕادەیەک خێرا بۆمان نەدەناسرانەوە. ئەوان لە خۆمان بالابەرزتر دەر چوون. بە جۆرێک، کە نەدەچووە ئەقڵەوە دەنگیان زل بوو. یەکێکمان دەیگوت: *هەست دەکەم مراوی بووم و لە هێلکەی قاز ترووکاوم.* حەزیان دەکرد زیاتر لەگەڵ خۆیاندا بن، وەک لەگەڵ ئێمەدا بن، وایان دەنواند یەک وشە لە قسەکانمان تێناگەن. کچەکانمان بە هەنگاوی گەورە و درێژ، بە شێوەیەکی ئەمەریکاییانە بە ڕێگەدا دەڕۆیشتن و ناشایستانە خێرا دەجووڵان. جلکی زۆر فشیان دەپۆشی. وەک مایین قونیان با دەدا. هەر کە لە قوتابخانەوە بۆ ماڵەوە دەگەڕانەوە، خێرا وەک قەرەج ناخونەکیان لە خواردن دەدا و ڕێک و ڕاست هەرچییان بە دەمدا بهاتایا، دەریان دەپەڕاند. بۆ نموونە، دەیانگوت گوێی میستەر دامپسی نووشتاوەتەوە. کوڕەکانمان زرتحۆل دەر چوون. پێچەقێنیان دەکرد، کە هەموو بەیانییەک لەباتی شۆربای لۆبیا، گۆشتی بەراز و هێلکە بخۆن. نەیاندەویست چیلکەی خواردن بەکار بهێنن. بە لیتر شیریان هەڵدەقوڕاند. ساسیان بەسەر برنجەکەیاندا دەڕشت. بە ئینگلیزییەکی ڕەوان، وەک ئەوەی ڕادیۆکە دەپەیڤین، هەرجارێکیش کە ئێمەیان دەبینی لە موبەق

نوێژ بۆ خواوەندی موبەق دەکەین، بە ئاماژەی گاڵتەپێکردن چاویان لێ قیچ دەکردین و دەیانگوت: "بۆ خاتری خوا... دایکە!"

بەزۆری پێمان تەریق دەبوونەوە. بە کڵاوە پانە پووشەکانمان و جلکە پرواوەکانمان تەریق دەبوونەوە. تەریق دەبوونەوە لە بە ئەکسێنت قسەکردنە قورسەکانمان، لە "ئێڤری سینگ ئۆ ڕای" تەکانمان تەریق دەبوونەوە. لە دەستوپلە قڵیشاو و تلۆقکردووەکانمان، لە دەموچاومان تەریق دەبوونەوە، کە دوای ئەو هەموو ساڵانەی قۆخڕنین و ڕۆنانی کەپری مێو لەبەر هەتاودا، ڕەشداگەڕاو و هێڵی درێژکۆلەیان تێ بووبوو. ئەوان تامەزرۆی ئەو باوکانە بوون، کە بە جانتای ڕاستی و بە چاکەت و پانتۆڵ و بۆینباخەوە دەچوون بۆ ئیش و تەنها ڕۆژانی یەکشەممەوان چیمەنیان دەبڕی. ئەوان دایکانی تایبەت و باشتریان دەویست، کە لە دەرەوەڕا ڕەتاو نەنوێنن. پێیان دەگوتین: ئەرێ ناتوانن نەختێک سووراو و سپیاو بکەن؟ زەندەقیان لەو ڕۆژە باراناوییانە لە گوند دەچوو، کە ئێمە دەڕۆیشتین و بە پیکابە شەقوشڕەکانمان، لە قوتابخانە دەمانهێنانەوە. ئەوان قەت قەت فەرمووی هاوڕێکانیان بۆ ماڵە تەنگ و تاریکەکانمان، لە گەڕەکە ژاپۆنینشینەکاندا نەدەکرد. دەیانگوت: *ئێمە وەک سواڵکەر دەژین.* ئەوان حەزیان نەدەکرد لەگەڵ ئێمەدا، لە ڕۆژی لەدایکبوونی ئیمپراتۆری ژاپۆن لە پەرستگەکەدا ببینرێن. حەزیان نەدەکرد لە ساڵڕۆژی ئازادکردنی مێروو* لە کۆتاییی هاوین، لە ئاهەنگی پارکەکەدا لەگەڵمان بەشدار بن. ملیان نەدەدا لە پاییزە فێستیڤاڵی بەرامبەربوونی شەو و ڕۆژ، لە جادەکاندا لەگەڵماندا سەما بکەن. پێمان پێدەکەنین، کاتێ داوامان لێ دەکردن بەیانیان یەکەم شتێک بیکەن، ئەوەیە بۆمان بنوشتێنەوە، هەر ڕۆژێک تێدەپەڕی، پێدەچوو زیاتر و

---

* Insektsbefriardagen: فێستیڤاڵێکە ساڵانە لە ٢٨ی مانگی مای، لە ژاپۆن ساز دەدرێ. و.ک.

زیاتر لەدەستمان بچن.

هەندێکیان بە جۆرێکی سەیر دەبوونە خاوەن زەخیرەوشەی زوبانە نوێیەکە و دەبوونە باشترین قوتابیانی پۆلەکانیان. خەڵاتی باشترین نووسینی دارشتنیان لەبارەی گوڵە کێوییەکانی کالیفورنیاوە دەبردەوە. زۆرباشەیان لە سروشتناسیدا دەهێنا. لە لیستی ماموستاکاندا، لە هەر قوتابییەکی تر زیاتر ئەستێرەی ئاڵتوونییان وەردەگرت. ئەوانی ترمان لە وەرزی درەودا لە تاقیکردنەوە دوا دەکەوتن و ناچار دەبوون ساڵێکی تر لە هەمان پۆلدا بمێننەوە. یەکێکیان لە تەمەنی چواردە ساڵیدا دووگیان بوو، هەنێردرایەوە تا لەگەڵ نەنکیدا لە کێڵگەیەکی کرمی ئاوریشم، لەوپەڕی خۆرئاوای ژاپۆندا بژی. *هەموو هەفتەیەک نامەی بۆ دەنووسیم و پرسیاری لێ دەکردم، کە ئاخۆ کەی دەتوانێ بۆماڵەوە بگەڕێتەوە.* یەکێکی تر خۆی کوشت. زۆریان قوتابخانەیان تەرک کرد. تاقمێکیان بووبوونە عەسابە. دەستە و تاقمی تایبەت بە خۆیان دروست دەکرد و یاسا و رێسای خۆیان دادەنا. لە یاساکانیاندا هاتبوو: نابێ نە ژن، نە کچ و نە هیچ چینییەکمان لەگەڵ بێ. ئێوارانێکی درەنگ بەو ناوەدا دەسووڕانەوە و بەدوای دەستە و تاقمە عەسابەکانی تردا دەگەڕان، تا شەڕیان پێ بفرۆشن و پیایاندا هەڵپژێن. دەیانگوت: دەی با چەند فیلیپینییەک بیراز بکەین. کاتێکیش کە ئەوەندە تەمبەڵ و تەپۆ دەبوون، نەیاندەتوانی دەڤەرەکە جێ بێڵن، ئەوا هەر لە گەڕەک دەمانەوە و شەڕی ناوخۆیان هەڵدەگیرساند. بە یەکدییان دەگوت، هەی ژاپۆنی لەعنەتی! هەندێکی تریان بە سەری نەوییەوە دەگەڕان و هەوڵیان دەدا نەبینرێن. بۆ هیچ ئاهەنگێک نەدەچوون، (بۆ هیچ ئاهەنگێک بانگ نەدەکران). هیچ ئامێرێکی موزیکیان نەدەژەند (هیچ ئامێرێکی موزیکیان نەبوو تا بیژەنن)، هیچ پۆستکارتێکی ڤالانتاینیان پێ نەدەگەیشت، (هیچ پۆستکارتێکی ڤالانتاینیان نەدەنارد). هیچ حەزیان لەوە نەبوو سەما بکەن (پێڵاوی گونجاویان نەبوو). وەک

تارمایی و بە خەیاڵی ڕۆیشتووەوە بەنێو ڕاڕەوەکاندا دزەیان دەکرد و کتێبەکانیان بە سینگیانەوە دەنووساند، وەک ئەوەی لە خەونێکدا وێڵ و سەرگەردان بووبن. ئەگەر کەسێک لە پاشەملە نازناوێکی لێ نابان، ئەوا گوێیان لێ نەدەبوو. ئەگەر کەسێک ڕووبەڕوو نازناوێکی لێ نابان، ئەوا تەنها سەری نەرێیان دەلەقاند و بە ڕێگەی خۆیاندا دەڕۆیشتن. ئەگەر کتێبی کۆنتری ماتماتیکیان بدرایەتێ، ئەوا شانیان هەڵدەتەکاند و بەئارامیەوە وەریان دەگرت. دەیانگوت: قەیدی ناکا، ئەگەرچی قەتیش حەزم لە ماتماتیک نەبووە. ئەگەر فۆتۆکانیان لە کتێبی ساڵدا، لەدوای دواوە بووایە، هیچ گوێیان پێ نەدەدا. لەژێر لێوەوە دەیانگوت: "ئەوە تەنها هەر خۆی وایە." یان دەیانگوت: "جا چییە؟" یاخود دەیانگوت: "هەر گوێشی مەدەرێ؟" لەبەر ئەوەی دەیانزانی هەرچییەک بکەن، هەرگیز بەتەواوەتی فەرموویان لێ ناکرێ. دەیانگوت: *ئێمە تەنها تاقمێک کەللەسەری بوداین.*

فێر بوون کام دایکانە بە میوانیمان بێن (میسز هانک، میسز ودراف، میسز ئەلفرید چاندلەر III) و لێنەگەڕێن کێ بە میوانیمان بێت (هەر هەموو دایکەکانی تر). فێر بوون لای کام سەرتاشانە قژیان چاک بکەن (سەرتاشە زنجییەکان) و خۆیان لە کام سەرتاشانە بەدوور بگرن (سەرتاشە مۆنەکانی بەشی باشووری گروڤێ). فێر بوون شتگەلێک هەن، کە ئەوان قەت قەت نایانبێت: کەپووی درێژتر، ڕووخسارێکی ڕووناکتر، لاقی درێژتر، کە لە دوورەوە ببینرێ. یەکێکیان دەیگوت: *هەموو بەیانییەک ڕاهێنانی خودرێژکردن دەکەم، بەلام لەوە دەچێ هیچ کەڵکی نەبێت.* فێر بوون کەی بۆیان هەیە بۆ مەلە بۆ *KFUM* بچن – ناسپیپێستەکان دووشەممان بۆیان هەیە – و کەی بۆیان هەیە بۆ تەماشاکردنی فیلم لە شانۆی پانتاگ، لە خوارەوە بۆ ناوەندی شار بچن (هەرگیز بۆیان نییە). فێر بوون کە هەمیشە دەبێ پێشتر تەلەفۆن بۆ

ڕێستۆرانت بکەن. *خواردنی ژاپۆنیتان دەوێ؟* فێر بوون بە ڕۆژ بەتەنیا نەچنە دەرێ و چی بکەن کاتێک تاریک دادێ و لە کۆڵانێکدا گیر دەخۆن. *تەنها پێیان بڵێ کاراتێ دەزانیت.* ئەگەر ئەوەش نەیخوارد، ئەوان فێر بوون بۆکس بوەشێنن. *ئەوان ڕێزی کەسێک دەگرن، کە بەهێز بێت.* فێر بوون کەرەستەی خۆپارێزی بەکار بهێنن. فێر بوون تووڕە خۆیان حەشار بدەن. *نا، بێگومان. ئەوە هەر هیچ نییە. فەرموو.* ئەوان فێر بوون قەت قەت ترسی خۆیان وەدیار نەخەن. فێر بوون بەشێک لە خەڵک بە بەختێکی گەورەترەوە لە خەڵکی تر لەدایک دەبن و لەم دونیایەدا شتەکان بەو چەشنە نین، کە هەمیشە بەگوێرەی حەز و خواستی بەشەر بن.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوان خەونیان دەبینی. یەکێکیان سوێندی دەخوارد ڕۆژێک لە ڕۆژان شوو بە قەشەیەک دەکا و ئەوسا ناچار نابێ ڕۆژانی یەکشەممەوان میوە بڕنێ. یەکێکی تر دەیویست پارەی پێویست پێکەوە بنێ، تا بێستانێکی پێ بکڕێ. یەکێک حەزی دەکرد وەک باوکی تەماتە بچێنێ. یەکێکی تر حەزی دەکرد ببێتە هەرشتێکی تر، جگە لە جووتیار. یەکێک دەیویست ڕەزێکی بۆ شەرابدروستکردن هەبێ. یەکێکی تر حەزی دەکرد مارکەی خۆی هەبێت. دەیگوت: *ناوی دەنێم بێستانی میوەی فوکودا.* یەکێک تەنها حەزی دەکرد لە کێڵگە دوور بکەوێتەوە. یەکێکی تر دەیویست بچێت بۆ کۆلێژ، گەرچی چ کەسێکی نەدەناسی، کە ڕۆژێک لە ڕۆژان شاری جێ هێشتبێت. دەیگوت: *من دەزانم ئەوە شتێیە، بەلام...* یەکێک پێی خۆش بوو لە گوند بژی و قەت جێی نەهێڵێت. دەیگوت: *ئێرە باشترە. کەس نازانێ ئێمە چین.* یەکێکی تر زیاتر شتێکی دەویست، بەلام نەیدەتوانی ڕێک بڵێ کە ئەو شتە چییە. دەیگوت: *تەنها ئەمە بەس نییە.* یەکێک حەزی لە تەپڵێکی سوینگ کینگ بوو لەگەڵ سەنجێکی هی - هات. یەکێکی تر حەزی لە ئەسپێکی پەنی بەڵەکبەڵەک بوو. یەکێک دەیویست ببێتە ڕۆژنامەدابەشکەر. یەکێکی تر ژووری خۆی بە کێلۆنەوە دەویست.

دەیگوت: هەموو ئەو کەسانەی دەیانەوێ بێنە ژوورەوە، دەبێ یەکەم جار لە دەرگە بدەن. یەکێک حەزی دەکرد ببێتە نیگارکێش و لە پاریس بۆ خۆی لە هەورەبانێکدا بژی. یەکێکی تر حەزی دەکرد لە تەکنیکی سەلاجەدروستکردندا بخوێنێ. دەیگوت: کۆرسی خوێندن بە نامە هەیە. یەکێک حەزی دەکرد پرد ڕاکێشێ. یەکێکی تر حەزی دەکرد پیانۆ بژەنێ. یەکێک حەزی دەکرد لەبری ئەوەی کار بۆ خەڵک بکات، لە شارێکەیەکدا مێزی میوەفرۆشیی خۆی هەبێت. یەکێکی تر حەزی دەکرد ستێنۆگرافی لە ئەکادیمیای مێریت سێکرێتال بخوێنێ و ئیشێکی ناو نووسینگەیەکیشی دەست بکەوێ. دەیگوت: *ئەوسا خەونەکانم دێنە دی*. یەکێک دەیویست لە گۆڕەپانی بۆکسێنی پرۆفیشیونالّدا ببێتە گرەیت تۆگۆیەکی* تر. یەکێکی تر دەیویست ببێتە سیناتۆر. یەکێک حەزی دەکرد ببێتە سەرتاش و دوکانی خۆی بکاتەوە. یەکێکی تر دووچاری شەپلەی منداڵان بووبوو، تاقە شتێک کە دەیویست، ئەوە بوو بتوانێ بەبێ سییە ئاسنەکەی هەناسە بدا. یەکێک حەزی دەکرد ببێتە شاوەستای بەرگدرووان. یەکێکی تر حەزی دەکرد ببێتە مامۆستا. یەکێک حەزی دەکرد ببێتە پزیشک. یەکێکی تر حەزی دەکرد ببێتە خوشکەکەی. یەکێک حەزی دەکرد ببێتە جەردە. یەکێکی تر حەزی دەکرد ببێتە ئەستێرە. ئەگەرچی دەمانبینی وا تاریکی نزیک دەبێتەوە، بەڵام هیچمان نەدەگوت و لێدەگەڕاین ئەوان لە خەونبینینی خۆیان بەردەوام بن.

* Great Togo: زۆرانبازێکی ئەمەریکاییی بە ڕەچەڵەک ژاپۆنی.

# خایین

لە دووەمین ڕۆژی جەنگەوە، پڕوپاگەندەکان دەبیستین.

پڕوپاگەندەکان لەبارەی لیستێکەوەن. خەڵکێک لە نیوەشەودا بۆ دوور ڕاپێچ دەکرێن. فەرمانبەرێکی بانق کە بەرەو ئیشەکەی چووە، چیدی هەرگیز بۆ ماڵەوە نەگەڕاوەتەوە. سەرتاشێک لە پشووی ژەمی فراڤینیدا دیار نەماوە. دوو ماسیگر شوێنبزر بوون. لێرەولەوێ پانسیۆن تالان کراون. مامەڵەیەکی بازرگانی ڕاگیراوە. ڕۆژنامەیەک داخراوە. بەڵام هەموو ئەوانە لە جێگەیەک ڕوویان داوە؛ لە دۆڵ و شارە دوورەکان ڕوویان داوە، لە شاری گەورەدا ڕوویان داوە، کە ژنان هەموو لەوێ پێڵاوی پاژنەبەرزیان لەپێدایە و سووراو دەکەن و تا نیوەشەو دەڕەقسن. بە خۆمان دەڵێین: "لێرە کەس حەقی بەسەر ئێمەوە نییە." ئێمە ژنانی سادە و ساکارین، کە بێقڕە دەژین و سەری خۆمان کز کردووە. نابینە مایەی سەرئێشە بۆ مێردەکانمان.

بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک پەردەی پەنجەرەکانمان دادەدەینەوە و لە کونی ژوورەوە بەدیار گوێڕادێران لە هەواڵەکانی شەڕ لە ڕادیۆوە دادەنیشین. ناومان لەسەر سندوقی پۆستەکانمان لا دەبەین. پێڵاوەکانمان لە هەیوان دەهێنینە ژوورەوە. منداڵەکانمان بۆ قوتابخانە نانێرینەوە. شەوانە دەرگەکانمان کیلون دەدەین و بە چپە لەگەڵ یەکدیدا دەدوێین. بە دیقەتەوە پەنجەرەکانمان دادەخەین. مێردەکانمان زیاتر لە جاران

دەخۆنەوە و لەسەر تەختەخەوەکانیان دەتلیسێن. سەگەکانمان لەبەر پێماندا دەنوون. هیچ پیاوێک نایەت و لە دەرگەمان نادا.

بە پارێزەوە لە ماڵەکانمان دێینە دەر. مانگی دیسەمبەرە، کچە گەورەکانمان دەڕۆن، تا وەک کارەکەر لە شارە دوورەکاندا کار بکەن و ڕۆژەکان بێدەنگ و بێجوولە تێدەپەڕن. هەر زوو دونیا تاریک دەکا. لە گوند هەموو بەیانییەک بەر لە کازیوە هەڵدەستین و دەچینە ڕەزەکانەوە و مێو دەبڕین. گێزەر لەو ئەرزە سارد و شێدارە هەڵدەکەنین. کەرەوز لێدەکەینەوە. برۆکلی چەپک دەکەین. چاڵی قووڵ لە ئەرزەکەدا هەڵدەکەنین تا شتەکانمان لە باران بپارێزین. بازەکان دزە دزە بەناو ڕیزە دارباِیامەکاندا دێن و لە بوولێڵی ئێوارەدا لوورەی ڕەوەگورگی شینەڵانی لە سەرەوە لەسەر چیاکە دەبیستین، کە یەکتر بانگ دەکەن. لە گەڕەکە ژاپۆنینشینەکاندا هەموو شەوێک لە موبەقەکانی یەکتردا کۆ دەبینەوە و تازەترین هەواڵەکان دەدەینە یەک. دەڵێن لە شارەکەی ئەولامانەوە هەڵکوتراوەتە سەر ماڵان. دوای تاریکداهاتن، شارێک ئابڵووقە دراوە؛ دە-دوازدە ماڵێک تەحەڕی کراون؛ هێڵی تەلەفۆن بچڕاون؛ مێزی نووسین هەڵگێڕدراونەتەوە؛ دەست بەسەر دوکومێنتدا گیراون؛ ناوی زیاتر لە لیستەکەدا ڕەش کراونەتەوە. کە بردوویانن، پێیان گوتوون: "قلچەی ددانشتنیش لەگەڵ خۆتان بهێنن!" ئیتر ئەوە و تەواو، ئیدی ببڕای ببڕای دەنگیان نەماوە.

خەڵکێک دەڵێن پیاوەکان خراونەتە قەتارێکەوە و بۆ دوور، بۆ ئەوبەری چیا، بۆ ساردترین ناوچەکانی وڵات، ڕاپێچ کراون. هەیە دەڵێ، ئەو پیاوانە هاوکاریی دوژمنیان کردووە و لە چەند ڕۆژی داهاتوودا سنوورداش دەکرێن. هەیشە دەڵێ، ئەوانە گوللەباران کراون. زوربەمان بەرپەرچی ئەو پروپاگەندانە دەدەینەوە، کەچی هەر خۆشمان بڵاویان دەکەینەوە – درندانە، بەبێ ڕەچاوکردن و پێچەوانەی خواستی خۆمان

بڵاویان دەکەینەوە. هەیشمانە نامانەوێ بە ڕۆژ باسی ئەو پیاوە ونبووانەمان بکەین، بەڵام بە شەو دێنە خەومان. دوو-سێ کەسمان خەون دەبینین، کە خۆمان ئەو پیاوە ونبووانەین. یەکێکمان – شیزوکو، کە لە (کیارنی ڕانچ) موبەق پاک دەکاتەوە و دەیەوێ هەمیشە ساز و ئامادە بێت – جانتایەکی بچووکی بۆ مێردەکەی پێچاوەتەوە و لە نزیک دەرگەکەوە دای ناوە: فڵچەی ددان، کرێمی ڕیشتاشین، سابوونێک، کێکێکی شوکولات و – جۆرە لەبەردڵانەکەی وی – دەستێک جلکی پاک. ئەوە ئەو شتانەن، کە پێی وایە ئەگەر ناوی مێردەکەی لە لیستەکەدا بێت و نۆرەی بێت و بێن و بیبەن، ئەوا لە زینداندا پێویستی پێیان دەبێت. هەمیشە سووکەترسێک، بەڵام ترسێکی کرۆژەری هەیە، کە شتێکی بیر چووبێت، شتێکی بچووک، بەڵام شتیکی زۆر گرینگ، کە لە ئاییندەدا لە فلان ڕۆژ و لە فیسار دادگەدا دەبێتە بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگر لەسەر بێتاوانیی مێردەکەی. لە خۆی دەپرسێ: بەڵام دەبێ ئەو شتە بچووکە چی بێ؟ کتێبێکی پیرۆز؟ چاویلکەیەکی خوێندنەوە؟ جۆرە سابوونێکی تر؟ ڕەنگە جۆرێکی بۆنخۆشتر؟ جۆرێکی پیاوانەتر؟ دەڵێ: بیستوومە لەو خوارەوە، لە دۆڵەکە، قەشەیەکی (شینتوێی*)یان لەبەر ئەوە دەسگیر کردووە، گوایە شمشاڵێکی گاڵتینەی لە-حەیزەران-دروستکراوی پێ بووە.

ئێمە ڕێک چی لەبارەی ئەو لیستەوە دەزانین؟ لیستێک، کە هەمان بەیانیی پەلامارەکە، بە پەلەپروزکێ دروست کراوە. لیستێک، کە زیاتر لە ساڵێک لەوەوبەر دروست کراوە. لیستێک، کە زیاتر لە دە ساڵە هەیە. لیستێک، کە بەسەر سێ کاتەگۆریدا دابەش بووە: کاتەگۆری A، ناسراو وەک خەتەری تەواو، کاتەگۆری B، خەتەرێکی چاوەڕوانکراو،

* Shinto: دیانەتێکی دێرینە لە ژاپۆن. واتە ڕێی خودایان.

کاتەگۆری C، لایەنگری دەسەڵاتی میحوەر*. بێئەندازە هاسان، هەر ناوێک بۆی هەیە بکەوێتە ئەو لیستەوە. تەنها خەڵکێک لە ڕەگەزی ئێمە دەکەونە ئەو لیستەوە. ئەڵمانیایی و ئیتاڵیاییش لە لیستەکەدا هەن، بەڵام ناوەکانیان لە خواری خوارەوەن. ناوەکانی لیستەکە بە مەرەکەبێکی ئەبەدیی سوور نووسراون. لیستەکە بە ئامێری تایپ لەسەر پێناسی تۆمار نووسراوە. لیستەکە بوونی نییە. لیستەکە هەیە، بەڵام تەنها لە کەللەی بەڕێوەبەری هەواڵگریی سەربازی، کە بە زەینە بلیمەتەکەی ناسراوە، هەیە. لیستەکە تەنها وەهمێکە لە خەیاڵی خۆماندا. لیستەکە زیاتر لە پێنج سەد ناوی تێدایە. لیستەکە زیاتر لە پێنج هەزار ناوی تێدایە. لیستەکە بێکۆتاییە. هەرجارێک کەسێک دەسگیر دەکرێ، ناوی لە لیستەکەدا دەکوژێنرێتەوە. هەرجارێک ناوێک لە لیستەکەدا دەکوژێنرێتەوە، ناوێکی تری تێدا دەنووسرێ. هەموو ڕۆژێک، هەموو هەفتەیەک، هەموو سەعاتێک ناوی تر دەخرێتە سەر لیستەکە.

بەشێکمان نامەی نەناسراومان لە پۆستەوە بە دەست دەگا، کە ئاگادارمان دەکەنەوە مێردەکانمان لە ڕیزدان. بۆمان دەنووسن: ئەگەر لەبری ئێوە بام، شارم جێ دەهێشت. تیاماندایە دەڵێ، مێردەکانیان لە کێڵگەکاندا لەلایەن فیلیپینیگەلی شەڕەنگێزەوە هەڕەشەیان لێ کراوە. دەڵێن بە چەقۆی سەوزەبڕینەکانیانەوە هێرشیان بۆ بردوون. هیتومی، کە زیاتر لە دە ساڵە وەک کارەکەر لە گودسیت پرینس ئیش دەکا، بە ڕۆژی ڕووناک و لە ڕێگەیدا بەرەو شار، دەمانچەی لێ دەر هێنراوە و ڕێگەی پێ گیراوە. میتسوکو ئێوارەیەکیان بەر لە شێوخواردن، دەچێتە

---

* Axelmakter: هاوپەیمانێتییە سەربازییەکەی جەنگی دووەمی جیهانی نێوان وڵاتانی ئەڵمانیای نازی و ئیتاڵیای فاشی، کە دواتر ژاپۆن بە بۆردومانکردنی بەندەری بێرل هاربەری، ئەمەریکا و پاشانیش نەمسا و ڕۆمانیا و بولگاریا و هەنگاریایان چوونە پاڵ. شەڕەکە بە سەرکەوتنی وڵاتانی هاوپەیمان: یەکێتی سۆڤێت و بەریتانیا و فەرەنسا و ویلایەتە یەککرتووەکانی ئەمەریکا کۆتایی هات. و.ک.

دەرەوە تا هێلکەی مریشکەکانی کۆ بکاتەوە، دەبینێ جلکەکانی بە تەنافەکەوە دەسووتێن. ئیتر ئێمە دەزانین ئەوە تەنها سەرەتایە.

لە وادەی تاقە شەوێکدا دەروجیرانەکانمان بە چاوێکی تر تەماشامان دەکەن. دەشێ ئەوە بەو کچە بچووکەی خوار ڕێگەکەدا بزانین، کە چیدی لە پەنجەرەی خانووە گوندییەکەیانەوە دەستمان بۆ ڕاناوەشێنێ. یان بەو مشتەرییە کریستیانە وەفادارە پیرەدا، کە کتوپڕ پێ لە دوکان و ڕێستورانەکانمان دەبڕێ. یان بە میس (تریمبڵ)ی خانەخوێمانەوە، کە بەیانییەکیان کاتێ موبەقەکەیمان بۆ خاوێن دەکردەوە، دەمانباتە لاوە و بە گوێماندا دەچرپێنێ: "دەزانن جەنگ بەڕێوەیە؟" خانمانی یانەکە دەکەونە بایکۆتکردنی مێزی میوەفرۆشییەکانمان، لەبەر ئەوەی دەترسن میوەکانمان بە زەرنیخ ژەهراوی کردبن. کۆمپانیاکانی بیمە، بیمەکانمان هەڵدەوەشێننەوە. بانقەکان، حیسابە بانکییەکانمان دادەخەن. شیرفرۆشەکە چیدی شیر ناهێنێتە بەردەرگەی ماڵەکانمان، بە چاوانێکی فرمێسکتێزاوەوە دەڵێ: "ئەوە فەرمانی کۆمپانیاکەیە." منداڵان نیگایەکمان دەکەن و ئیدی وەک ئەوەی بە بینینی ئاژەڵێکی کێوی زارەترەک بن، چنگلەسەرشان ڕادەکەن. کاتێ خانمە پیرە بچووکەکان مێردەکانمان دەبینن، توند توند جانتا دەستییەکانیان بە خۆیانەوە دەنووسێنن و وەک ئیفلیج لەسەر شۆستەکان ڕادەوەستن و دەزریکێنن: "ئەوەتان!" ئەگەرچی مێردەکانمان ئاگاداریان کردبووینەوە – *ئەوانە دەترسن* – کەچی ئێمە ئامادە نەبووین لە ناکاوڕا خۆمان وەک دوژمن ببینینەوە.

هەڵبەت هەر هەموو شتەکان یەکەم جار لە قسەوباسی ناو ڕۆژنامەکانەوە دەست پێ دەکەن. ڕۆژنامەکان دەنووسن، گوایە هەزاران کەس لە پیاوەکانمان لە هەمان ئەو لەحزەیەی بۆردومانی بەندەرەکە کراوە، بە دیقەتێکی ڕاگوزەرییانەوە کاردانەوەیان نواندووە. ڕۆژنامەکان دەنووسن گوایە ئێمە بە پیکابە شەقوشڕ و ترومبێلە

خەڕەکەشکاوەکانمانەوە دەڕژێینە ڕێوبانەکانەوە. دەنووسن، گوایە ئێمە لە کێڵگەکانمانەوە بە مەشخەڵ ئاماژە بۆ فڕۆکەکانی دوژمن دەدەین. دەنووسن، هەفتەی بەر لە هێرشەکە زۆر لە منداڵەکانمان فشەیان بۆ هاوپۆلەکانیان کردووە کە، "شتێکی گەورە بەڕێوەیە ڕوو بدا." دەنووسن، کاتێ مامۆستاکانیان دەچنە بنجوبنەوانی مەسەلەکە، گوایە ئەو منداڵانە دەڵێن کە دایکان و باوکانیان بە بۆنەی هەواڵی هێرشەکەوە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک ئاهەنگیان گێڕاوە. دەڵێن: هەلهەلەیان لێداوە و قریواندوویانە. دەنووسن، لە کاتی ڕوودانی هێرشی دووەمدا بۆ سەر وڵات، بەوپەڕی دڵنیاییەوە هەموو ئەوانەی ناویان لە لیستەکەدایە، دەکەونە ئاژاوەنانەوە، تا یارمەتیی دوژمن بدەن. دەنووسن، باغەوانەکەیان سەربازی هێزی پیادە بووە لە سوپایەکی گەورەی نهێنیدا. دەنووسن، ئەوانە هەزارەها پارچەچەکیان لە خوارەوە، لە ژێرزەمینی سەوزەواتەکانیانا حەشار داوە. دەنووسن، کوڕە خزمەتکارەکانیان سیخوڕی دەکەن. دەڵێن باخەوانەکانیان هەر هەموویان ئامێری شەپۆلی کورتیان لە سۆندەکانیاندا حەشار داوە و هەر کە سەعاتی سفر دێت، ئیدی دەکەونە خۆ و دەستبەکار دەبن: بەنداو دەڕوخێنن؛ بۆریی نەوت دەسووتێنن؛ پردەکان بۆمبباران دەکەن؛ ڕێوبانەکان دەتەقێننەوە؛ تونێلەکان دادەخەن و عەمباراوەکان ژەهراوی دەکەن. دەڵێن: ئەدی چی ڕێگەیان لێ دەگرێ کە یەکێکیان ڕێک بە پشتێنە تیئێنتی بەستراوەکەی نێوقەدییەوە، خۆی بە گۆڕەپانێکی قەرەباڵغدا بکا و خۆی بتەقێنێتەوە؟ هیچ شتێک.

دەکەوینە ئەوەی هەموو ئێوارەیەک کە تاریک دادێ، شتەکانمان بسووتێنین: پسووڵەی کۆنی پارەدەرهێنان لە بانق، دەفتەری یادداشتنامە، ئەڵتاریی بودای خێزان، چیلکەی نانخواردن. چرای کاغەزین، فۆتۆی خزمانمان لە گوند، کە شێلگیرانە بە جلکە لادێییە

سەیروسەمەرەکانیانەوە ڕاوەستاون. من بینیم چۆن ڕووخساری براکەم ببووە خۆڵەمێش و بەرەو ئاسمان خولی دەخوارد. لە دەرەوەی ماڵەکانمان، لە باغی سێوەکانمان و لە چاڵی نێوان درەختەکاندا، ئاگر لە جلکی ئاوریشمیی بوکێنییەکانمان بەر دەدەین. لە جادەکانی پشتەوەی گەڕەکە ژاپۆنینشینەکاندا و لە تەنەکەی خۆڵەکاندا، بەنزین بە بوکەشووشە یادگارییەکانماندا دەکەین. خۆمان دەسبەرداری هەر هەموو ئەو شمەکانە دەکەین، کە بۆی هەیە پەیوەندیی مێردەکانمان بە دوژمنەوە بسەلمێنێ. نامەی خوشکەکانمان دەسووتێنین، کە تیایاندا نووسیویانە: کوڕە دراوسێکەی ماڵەکەی ئەولامانەوە، ژنی چەترچییەکەی هەڵگرتووە. نامەی باوکانمان دەسووتێنین، کە تیایاندا نووسیویانە: قەتار بووەتە کارەبایی و چیدی کاتێک بە تونێلێکدا تێدەپەڕین، هەموو دەموچاومان نابێتە سووتوو. نامەی دایکانمان دەسووتێنین، کە هەر لە یەکەمین ڕۆژی سەفەرەکەمانەوە بۆیان دەنووسین. هێشتا جێگەپێکانتان لە خوارەوە، بە قوڕی ڕووبارەکەوەیە. سەیرمان لێ دێت کە ئاخۆ بۆچی ماوەیەکی ئەوەندە درێژ، پێچەقێنانە بە خووەکانمانەوە نووساوین. بە خۆمان دەڵێین: خۆمان بووینە مایەی ئەوەی ڕقیان لێمان بێ.

شەوەکان تاریک و تاریکتر و سارد و ساردتر دەبن. ڕۆژانە دەبیستین پیاوی زیاتر ڕاپێچ دەکرێن. شمەک پەخشیارێک لە باشوور. مامۆستایەکی جۆدۆ. بازرگانێکی ئاوریشم. نمایندەیەکی بار لە شار، کە دوای فراڤینێکی درەنگ بەڕێوە بووە بۆ نووسینگەکەی بگەڕێتەوە، لە چوارڕاکە و لە کاتێکدا چاوەڕێی چرای سەوز بووە، دەسگیر کراوە. پیازچێنەرێک لە دێلتا، کە گومانی لێ کراوە پلانی تەقاندنەوەی بەنداوەکەی دارشتبێ. قووتوویەکیان بە پووشەڵۆکەی تێئێنتیەوە لە کادانەکەیدا دۆزیوەتەوە. کارمەندێکی نووسینگەی سەفەر. مامۆستایەکی زوبان. کاهووچێنێک لە کەنار، کە گومان دەکرێ بە لایتە دەستییەکەی

ئامـاژەی بـۆ کەشـتییەکی دوژمـن لـە زەریـادا دابـێ.

ئیـدی مێردەکـەی چیۆمیـس بـە جلەکانـی بەرییـەوە دەنوێـت، ئـەوەش لەبـەر ئـەوەی کـە نەبـا شـەو بێـن و بیبـەن. بـە ژنەکـەی گوتـووە: شـەرمەزارانەترین شـت ئەوەیـە، کە بنیادەم بە بیجامـەوە دەسـگیر بکرێـت. (ئاخر مێردەکەی ئیکو بە بیجامـەوە دەسـگیر کراوە). مێردەکەی ئاسـاکو بـە پێڵاوەکانییـەوە گرتوویەتـی. هەمـوو شـەوێک تـا بریقەیـان لـێ دێنـێ، دەیانسـڕێ و پاشـان لەبـەر لاقـی دواوەی تەختەخەوەکـەدا دایـان دەنـێ. مێردەکـەی یوریکـو، کـە فرۆشـیارێکی دێـوەرەی شـمەکی هونەرییـە، سـاڵ دوازدەی مانـگ بـۆ ژنەکـەی هەمـوو شـتێکە، تەنهـا وەفـادار نییـە، کەچـی هەنووکـە تـا ژنەکـەی سـفت لـە پاڵیـدا ڕانەکشـێت، خـەوی لـێ ناکەوێت. ژنەکـەی دەڵـێ: *هەڵبـەت تـازە کەمێـک بـۆ ئـەوە درەنگـە، بـەڵام دەسـەڵاتم چییە؟ کە بنیادەم شوو دەکا، بۆ هەتا هەتایە دەیکا.* مێردەکەی هاتسومی هەمـوو شـەوێک، کاتـێ دەچێتـە نێـو جێگـە، لەبـەر خۆیـەوە وێردێکـی خێـرا بـۆ بـودا دەخوێنـێ. هەنـدێ شـەو لـە عیسـاش دەپاڕێتـەوە، لەبـەر خۆیـەوە دەڵـێ: کـێ ناڵـێ ئـەو تاقـە خـودا ڕاسـتەقینەکە نییـە؟ مێردەکـەی ماسـومی بەدەسـت مۆتەکـەوە لـە عەزابدایـە. لـە خەونیـدا دونیـا تاریـک؛ جـادەکان دیـار نەمـاون؛ زەریـا هەسـتاوە؛ ئاسـمان داچـووە؛ ئەو لـە دوورگەیەک جێ هێڵراوە؛ لـە بیابانێکدا سـەرگەردان بـووە، جزدانەکـەی ون کـردووە و زۆر درەنـگ بـە قەتـاردا ڕاگەیشـتووە. ژنەکـەی لەنێـو حەشـاماتێکدا دەبینـێ، ڕادەوەسـتێ و بانگـی دەکا، بـەڵام ئـەو هـەر ئاوڕیشـی لـێ ناداتـەوە. پێـی دەڵـێ: غـەم و خەفـەت تاقـە شـتێک بـووە، کـە ئـەم پیـاوە پێـی بەخشـیوم.

یەکەمیـن لێزمـە بـاران و باڕێزە، دواییـن گـەڵای درەختـەکان دەوەرێنـن و ڕۆژەکان خێـرا فێنـک دەبـن. وردەوردە سـێبەرەکان درێژتـر دەبـن. منداڵـە بچووکترینەکانمـان هەمـوو بەیانیانێـک بـۆ قوتابخانـە دەچـن و بـە حەکایەتکەڵـەوە دەگەڕێنـەوە. کچێـک لـە پشـووەکەدا دراوێکـی بچـووک

قووت دەدا و خەریک دەبێ بمرێت. میستەر بارنت هەوڵ دەدا سمێڵ دانێتەوە. میسز تراچتێنتبێرگ میزاجی باش نەبووە. سووڕی مانگانەیەتی. ڕۆژە درێژەکان لەگەڵ مێرد و کوڕە گەورەکانماندا لە بێستانەکاندا دەبەینە سەر و لەوێ پەلکی درەخت دەبڕین. بە درەختەکاندا ڕادەگەین، ئەو چڵانەیان دەبڕینەوە، کە بۆ هاوین یان پاییز بەر نادەن. چێشت بۆ ئەو ماڵانە لێدەنێین و گسکیان بۆ دەدەین، کە ساڵانێکە چێشتیان بۆ لێدەنێین و گسکیان بۆ دەدەین. هەموو ئەو شتانە دەکەین، کە هەمیشە دەیانکەین، بەڵام هیچ شتێک لە جاران ناچێت. ئۆناتسو دەڵێ: "بە یەک نەخت دەنگ دەترسم. بە تەقەلەدەرگەدان، بە زەنگی تەلەفۆن، بە وەڕینی سەگ. هەمیشە گوێم لای تەپەی پێیە." هەموو جارێک کە ترومبێلی ڕێبوارێک بەو دەوروبەرەدا دەڕوا، ئیدی دڵی وەتەپە دەکەوێ، چونکە دڵنیایە کە ئیدی نۆرە هاتووەتە سەر مێردەکەی. هەندێ جار لە ساتەوەختە زیاتر شپرزەکانیدا، پێی وایە پێشتر ئەوە ڕووی داوە و مێردەکەی ڕاپێچ کراوە. ئەوسا هەست بە سووکەڵەیی دەکا، لەبەر ئەوەی چاوەڕوانی بەلایەوە لە هەرشتێکی تر قورسترە.

بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بایەکی سارد لە چیاوە هەڵدەکا و نایخات. هەورێک لە تۆزوخۆڵ لە کێڵگەکانەوە بەرز دەبێتەوە و پەلکی ڕووتی درەختەکان قامچیی لە ئاسمانێکی بەتاڵی خۆڵەمێشی دەدا. کێلەکان لە گۆڕستانەکانماندا دەکەون. دەرگەی حەوشەکانمان لە گرێژنە دەچن. ساپیتە تەنەکەکان دەلەرنەوە. سەگە خۆشەویستەکانمان تێدەتەقێنن. چینییەکی جلکشۆر بێهۆش و خوێناوی، لە کەنار دەدۆزرێتەوە، لەوێ جێ هێڵراوە، تا بمرێ. *وایان زانیوە یەکێکە لە ئێمە*. ئاگر لە گەورێکی دووری دۆڵێکی ناوەڕاستی وڵات بەر دەدرێ، بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک، با بۆگەنی ئاژەڵی سووتاو لەگەڵ خۆیدا دێنێ.

شەوانە لە موبەقەکانمان لەگەڵ مێردەکانمان دادەنیشین و لە کاتێکدا

ئەوان سەریان بەسەر ڕۆژنامەدا شۆڕ دەکەنەوە و لە هەموو دێڕ و وشەیەک ورد دەبنەوە و بەدوای سەرەداوێکدا لەبارەی ئاییندەمانەوە دەگەڕێن، قسەوباس لەبارەی دوایین پڕوپاگەندەکانەوە دەکەین. دەڵێین: بیستوومانە گوایە دەمانخەنە ئۆردووگای کارەوە، تا دانەوێڵە بۆ سوپا بەرهەم بهێنین. ڕادیۆ دادەگیرسێنین و گوێ لە بەیاننامە لە بەرەی جەنگەوە ڕادەدێرین. هەڵبەت دەنگوباسەکان باش نین. دوژمن شەش کەشتیی جەنگی لەغەرقنەهاتووی تری ئێمەی غەرق کردووە. فڕۆکە جەنگییەکانی دوژمن لە فڕینی ئەزموونیدا، لە ئاسمانی ئێمەدا بینراون. ژێردەریاییەکانی دوژمن لە کەنارەکانمان نزیک و نزیکتر دەبنەوە. دوژمن پلانی هێرشێکی دەرەکی و ناوەکی بۆ سەر کەنارەکانمان دارشتووە و داوا لە هاوولاتییە بەئاگا و چاوتیژەکانمان دەکا، دەزگا بەرپرسەکان لە هەر تابوورێکی پێنج ئاگادار بکەنەوە، کە دەکرێ خۆی لەناوماندا مەلاس دابێ. بیرمان دەخەنەوە: ڕێی تێ دەچێ هەرکەسێک لەوان سیخوڕ بێت: خزمەتکارەکەت، باخەوانەکەت، گوڵفرۆشەکەت، کارەکەرەکەت.

سەعات سێی بەیانی، یەکێک لە جووتیارە هەرە ناسراوەکانمان لە جێگەی نوستنەکەی دەر دەهێنرێ و بە دەرگەی حەوشەدا ڕاپێچ دەکرێتە دەرەوە. ئەو لە یەکەمین ئەو پیاوانەیە، کە ئێمە دەیناسین و ڕاپێچ کراون. خەڵک دەڵێن ئەوان چاویان لەسەر جووتیارە کامڵەکانە. بۆ شەوی دواتر، جووتیارێک لە سپیگیل ڕانچ بە بەدلە قوراوییەکەیەوە و لە کاتێکدا بای باڵی سەگەکەی لای بەنداوەکەوە دەدا، دەبێ بە تەڵەکەوە و بۆماوەی سێ ڕۆژ و سێ شەو لە ژوورێکی ڕووناکی بێ پەنجەرەدا لێکۆڵینەوەی لەگەڵ دەکرێ و پاشان مەرەخەسیان کردووە بۆ ماڵەوە بگەڕێتەوە. بەڵام کاتێ ژنەکەی ترومبێلەکەی بەرەو خوار بۆ بنکەی پۆلیس دەهاژوێ تا بیهێنێتەوە، کەچی ئەم هەر هیچ نایناسێتەوە و

نازانن کێیە. ژنەکەی دەڵێ: مێردەکەم وای دەزانی دەمەوێ فریوی بدەم و هەوڵ دەدەم قسەی لێ دەر بهێنم. ڕۆژی دواتر سێ ژن، کە ئێمە دەیانناسین، لە شارێکی دراوسێمانەوە دێن و دەڵێن ناوی مێردەکانی ئەوانیش لە لیستەکەدان. یەکێکیان دەڵێ: مێردەکەیان ناوەتە ترومبێلێکەوە و ئیتر دیار نەماوە. دوو ڕۆژ دواتر، یەکێک لە کێبەرکێکەرەکانمان — تاقە کەسێک لە چێنەرەکانی دۆڵەکە، کە لانی کەم نیوەی کشمیشەکانی وەک ئەوانی ئێمە شیرینن — لە موبەقەکەیدا لەسەر کورسییەک دەبەسرێتەوە و بۆ ماوەی چوار سەعات بەو شێوەیە دەهێڵرێتەوە، لە کاتێکدا سێ پیاو خەریکی تەحەڕیکردنیماڵەکەی دەبن و پاشان ئازادی دەکەن. خەڵکی دەڵێن ژنەکەی پای و قاوەی بۆ پیاوەکان داناوە. هەمووان حەز دەکەن بزانن ئاخۆ ئەوە چ جۆرە پایەک بووە؟ ئاخۆ شیلک بووە؟ ڕێواس یان مەرەنگی لیمۆ بووە؟ هەروەها خەڵک دەیانەوێ بزانن ئاخۆ پیاوەکان حەزیان کردووە قاوەکانیان چۆن بێ؟ بە شەکرەوە بێت یان بێ شەکر؟

هەندێ شەو، پیاوەکانمان بۆ چەند سەعاتێک بە بێداری دەمێننەوە و دووبارە و سێبارە ڕابردووی خۆیان بەدوای نیشانەیەکدا، کە ئاخۆ ناوەکانیان لە لیستەکەدا نەبێت، هەڵگێڕوداگێڕ دەکەن. بەدڵنیاییەوە هەر دەبێ شتێک لەو قسانە بدۆزنەوە، کە گوتوویانە یان کردوویانە، بەدڵنیاییەوە هەر دەبێ شتێک لەو هەڵانە بدۆزنەوە، کە بەسەریاندا تێپەڕیوە، بەدڵنیاییەوە هەر دەبێ بە شتێک تاوانبار بن، ڕەنگبێ بە جۆرە تاوانێکی ناڕوون، کە تەنانەت ئەوان خۆشیان نازانن چییە. لە ئێمە دەپرسن: بەڵام بڵێی ئەو تاوانانە چی بن؟ بڵێی ئەو پێکە نەبێت، کە لە سەیرانەکەی هاوینی ساڵی ڕابردوودا لە خۆشیی نیشتمان هەڵمان داوە؟ یان کۆمێنتێک نەبێ کە لەبارەی نوتقەکەی ئەم دواییەی سەرۆکەوە لە دەممان دەرچووە؟ ئاخر سەرۆک ناوی بە شەلاتی هێنابووین. یان

بڵێی تاوانەکەیان بەهەڵەکۆمەککردنی ڕێکخراوێکی خێرخواز نەبێت؟ - ڕێکخراوێکی خێرخواز، کە پێوەندیی بە دوژمنەوە هەیە و ئەمان هیچ لەوە ئاگادار نەبوون؟ ئایا دەکرێ ئەوە بێت؟ یاخود کەسێک - کەسێک، کە بەدڵنیاییەوە ڕقی لێیانە - شیکاتێکی درۆیینەی لە دژیان بۆ دامودەزگاکان بەرز کردۆتەوە؟ ڕەنگبێ یەکێک لە مشتەرییەکان بێ لە کاپیتول لاوندری، کە ئێمە جارێک لە جاران بێ مەبەست قسەی ڕەقمان پێ گوتووە؟ (بەڵام ئایا هەموو شت هەڵەی خۆمان بووە؟) یاخود دەشێ ئەو کەسە هاوسێیەکی ناقایل بێت، کە زۆر جاران سەگەکەمان لە باخەکەیدا خونچەی گوڵەکانی شێلاوە؟ مێردەکانمان لێمان دەپرسن: ئایا نەدەکرا میهرەبانتر بووینایە؟ بڵێی کێڵگەکانیانمان بێخزمەت نەکردبن؟ بڵێی ئێمە زیاد لە پێویست کەمدوو نەبووبین؟ یان گوناهەکانمان بەئاشکرا لە ڕووخسارمان نەنووسرابن، بە جۆرێک، کە هەموو دونیا ببینن؟ یان هەر بەڕاستی بە هۆی ڕووخسارمانەوەیە، کە گوناهبارین؟ ئایا ڕووخسارمان بە جۆرێک لە جۆرەکان بووەتە مایەی بێزارییان؟ یان لەوەش خەراپتر: بووەتە مایەی ڕەنجاندنیان؟

لە یانوەریدا فەرمانمان پێ دەکرێ ناوی خۆمان لای دەزگا پەیوەندیدارەکان تۆمار بکەین و هەموو شتە قەدەغەکانمان تەسلیمی بنکەی پۆلیسی گەڕەکەکانمان بکەین: تفەنگ، بۆمب، تیئێنتی، کامێرا، دووربین، چەقۆ بە دەمی زیاتر لە پازدە سانتیمەتر درێژەوە، ئامێری ئاماژەدانی وەک لایتی گیرفان و مەشخەڵ، هەموو شتێک کە بکرێت یارمەتیی دوژمن لە هێرشبردندا بدا. پاشان سنووربەندییەکانی سەفەرکردن - هیچکام لە ئێمە بۆی نییە زیاتر لە پێنج کیلۆمەتر لە ماڵەوە دوور بکەوێتەوە - پاشان قەدەغەکردنی هاتووچۆ لە سەعات هەشتی شەوەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە زوربەمان هەر بەڕاستی ئەهلی شەو نین، بەڵام بۆ یەکەم جار لە ژیانماندا پەرۆشی ئەوە دەبین، کە

نیوەشــەوان پیاســەیەک بکەیـن. *تەنها یـەک جـار، لەگـەڵ مێردەکـەم، بـە بێسـتانی داربایەمەکـەدا، تـا بزانـم پیاسـەی شـەوانە تامـی چ دەدا.* بـەڵام کاتێ سـەعات دووی بەرەبەیـان لـە پەنجەرەکـەوە لـە دەرەوە دەنۆڕیـن و دەبینیـن هـاوڕێ و هاوسـێکانمان کادانەکانمـان تـاڵان دەکـەن، لـە ترسـی ئـەوەی نەبا خەبـەری پۆلیسمان لێ بدەن، ناوێریـن لاقمان ببەینە ئەودیو دەرگـەی حەوشـەکانمانەوە. لەبـەر ئـەوەی سـوور دەزانیـن تەلەفۆنێـک بەسـە تـا ناوێـک بچێتـە لیسـتەکەوە. کاتێ کـوڕە گەورەکانمـان دەکەونـە ئـەوەی تـەواوی شـەوانی شـەمموان لـە شـار لـە دەرەوە بمێننـەوە، کـە بەیانـی بـۆ ماڵـەوە دێنـەوە، لێیـان ناپرسـین دوێشـەو لەکوێ بـوون یـان لەگەڵ کام کچدا بوون، یاخود چەندیـان پێ خـەرج کـردوون، یـان بۆچی باجیان بە ئێخـەی کراسـەکانیانەوە کردووە و لێی نووسراوە من چینییم. مێردەکانمـان دەڵێـن: "لێگـەڕێ چەندێـک دەتوانـن خـۆش بیگوزەرێنـن." ئەوسـا لـە موبـەق بـە ڕێـزەوە بەیانیبـاش لـە کوڕەکانمـان دەکەیـن و دەڵێیـن: هێلکـە یـان قـاوە؟ وا دەڵێیـن و ئیـدی لەگـەڵ کاروبـاری ئاسـاییی ڕۆژانەمانـدا تـێ هەڵدەچینـەوە.

مێردەکانمان پێمـان دەڵێن: "کاتێ دوور کەوتمـەوە..." ئێمـەش وەڵامیـان دەدەینـەوە: "ئەگـەر دوور کەوتیتـەوە...!" دەڵێن: "بیرتـان نەچێ ئاو بدەنـە سەهۆڵفرۆشـەکە" و " کاتـێ مشـتەری دێتـە بـەر دەرگـە، هەمیشـە بـە نـاوی خـۆی بەخێرهاتنـی بکـەن." مێردەکانمـان پێمـان دەڵێن بەڵگەنامـەی لەدایکبوونـی منداڵەکانمـان لەکـوێ هەڵگیـراوە و کـەی داوا لـە (پیتـێ) لـە وەرشـەکە بکەیـن، کـە تایـەی لۆرییەکەمـان بـۆ بگۆڕێـت. دەڵێـن: "ئەگـەر پێویسـتتان بـە پـارە بـوو، ئـەوا تەراکتۆرەکـە بفرۆشـن." "گوڵخانەکـە بفرۆشـن." "شـمەکی دوکانەکـە بفرۆشـن." بیرمـان دەهێننـەوە، کـە ئێمـە دەبێ ئاگامـان لـە ئـاکار و ڕەفتارمـان بێـت – شـانمان بـۆ دواوە – و لێنەگەڕێیـن منداڵەکانمـان کەمتەرخەمـی لـە کارەکانیانـدا بنوێنـن. دەڵێـن:

"پەیوەندی بە میستەر هاوەر لە یەکێتی میوەچێنەرانەوە بکەن. ئەو کەسێکی گرینگە بیناسن و ڕەنگە بتوانێ یارمەتیتان بدا." دەڵێن: "باوەڕ بە هیچ قسەیەک مەکەن کە لەبارەی ئێمەوە دەیبیستن" و "متمانەتان بە کەس نەبێت." و "هیچ شتێک بۆ دەرودراوسێ مەگێڕنەوە." دەڵێن: "خەمی مشکی بنمیچەکەتان نەبێ. کاتێ خۆمان بۆ ماڵەوە دەگەڕێینەوە، چاریان دەکەین." بەبیرمان دێننەوە کە هەمیشە کاتێ دەچینە دەرەوە، پاسپۆرتە بیانییەکانمان لەگەڵ خۆماندا ببەین و خۆمان بەدوور بگرین لە هەر بەحس و جەدەلێک لەبارەی جەنگەوە. ئەگەر تکامان لێ کرا ڕای خۆمان بڵێین، ئەوا هەرچۆنێک بێ، دەبێ بە دەنگی بەرز و بە تۆنێکی ڕێک و ڕەوان هێرشەکە مەحکوم بکەین. پێمان دەڵێن: "داوای لێبووردن مەکەن." "تەنها بە ئینگلیزی قسە بکەن." "خووی خۆچەماندنەوە بە خۆتان تەرک بکەن."

لە ڕۆژنامە و ڕادیۆکاندا قسە لەبارەی سنووررداشکردنەوەی بەکۆمەڵەوە دەکرێت. *ئەنجومەنی نوێنەران تاووتوێی پێشنیارەکەی دەسەڵاتی بەرگری، سەبارەت بە کۆچبەران دەکا. پارێزگار سەرۆک هان دەدا کەناری زەریا لە هەر هەموو پەنابەرە دوژمنەکان چۆڵ بکا. دەڵێ بۆ (توکیو) یان بگەڕێننەوە.* دەبیستین ئەوە پلەبەپلە ڕوو دەدا، لە ماوەی چەند هەفتەیەک یان ڕەنگە چەند مانگێکدا. کەسمان لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا ناچار ناکرێین بڕوات. ئێمە دەبێ بۆ دوور ڕەوانە بکرێین، بۆ جێگەیەک، کە خۆمان هەڵی دەبژێرین، جێگەیەک، دوور لە قووڵاییی وڵات، کە لەوێ نەتوانین هیچ زەرەرێک بدەین. ئێمە دەبێ تا شەڕ بەردەوام دەبێت، دەستبەسەر بین. تەنها ئەوانەمان کە کەمتر لە شازدە میل لە کەناری زەریاوە دوورن، دەبێ ڕابگوێزرێن. تەنها ئەوانەمان کە ناویان لە لیستەکەدا هەیە، ڕادەگوێزرێن. تەنها ئەوانەمان کە هاووڵاتی نین، ڕادەگوێزرێن. منداڵە گەورەکانمان ڕێگەیان

پێ دەدرێت بمێننەوە، تا چاویان لە کارگە و کێڵگەکانمان بێت. دەبێ دەست بەسەر کارگە و کێڵگەکانماندا بگیرێن و مەزاد بکرێن. *هەر لە ئێستەوە دەستیان پێوە بنێن.* ئێمە دەبێ لە منداڵە گەنجەکانمان جیا بکرێینەوە. ئێمە دەبێ بخەسێندرێین و لە یەکەمین دەرفەتی کردەگی و گونجاودا سنوورداش بکرێین.

هەوڵ دەدەین بیری ئەرێنی بکەینەوە. لە دڵی خۆماندا دەڵێین، ئەگەر تا بەر لە نیوەشەو لە ئووتووکردنی جلوبەرگی مێردەکانمان ببینەوە، ئەوا ناویان لە لیستەکەدا دەسڕدرێتەوە. ئەگەر سەنەدێکی دە دۆلاریی جەنگ بکڕین، ئەوا منداڵەکانمان لە ئەماندا دەبن. ئەگەر گۆرانیی تەشیرستن ڕێک و ڕەوان و بێهەڵە بچڕین، ئەوا چ لیستێک، چ جلکشتنێک، چ سەنەدی جەنگ و چ جەنگێک بوونیان نابێ. بەڵام وردەوردە کە تاریک دادێ، بەزۆری هەست بە ناڕەحەتی دەکەین، وەک ئەوەی شتێک هەبێ و بیرمان چووبێ بیکەین. دەڵێین بڵێی بیرمان نەچووبێ دەریچەی حەوزەکە دابخەین؟ بڵێی بیرمان نەچووبێ، تەباخەکە بکوژێنینەوە؟ بڵێی بیرمان نەچووبێ، دان بدەینە مریشکەکان؟ خۆراک بدەینە منداڵەکان؟ بڵێی بیرمان نەچووبێ، سێ جار لە کۆڵەگەی تەختەخەوەکە بدەین؟

لە فێبراوەریدا وردەوردە ڕۆژەکان گەرمتر دەبن و یەکەمین گوڵاڵەسوورەکان لە دامێنی چیادا بە ڕەنگی پرتەقاڵی پرشنگ دەدەن. ئێمە هێشتا وەک گروپ بەردەوام دەچینەوە یەک. مێردەکەی مینیکو بێسەروشوێنە. مێردەکەی تاکیکو بێسەروشوێنە. *گوللەیەک لە ئەرزەکەدا، لەودیو ئەمباری ئاوردووەکەی دۆزراوەتەوە.* مێردەکەی ئومیۆ لەبەر ئەوەی پێنج دەقیقە دوای دەستپێکردنی وادەی قەدەغەکردنی هاتووچۆ چووەتە دەرەوە، لە ئۆتۆبان دەستگیر کراوە. مێردەکەی هانایو بە هۆکاری نادیار لەسەر مێزی نانی نیوەڕۆ دەستبەسەر کراوە. ژنەکەی

دەڵێ: "خەراپترین شتێک کە شووەکەی ڕۆژێک لە ڕۆژان کردبێتی، ئەوەیە ترومبێلی بە هەڵە پارک کردووە و غەرامەی بۆ نووسراوە" مێردەکەی (شیماکو)ش، کە لۆری بۆ کۆمپانیای (یونیەن فریوت) دەهاژوێ و قەتاوقەت هیچ کەسێک قسەیەکی ناڕەزایەتی لێ نەبیستووە، لای ڕەفەی شیرەکانەوە لە سۆپەرمارکێتەکەی گەڕەک دەسگیر کراوە، لەبەر ئەوەی گوایە سیخوڕی باڵە ڕاستە سەربازییەکەی دوژمنە. یەکێک دەڵێ: "خۆم هەر دەمزانی." یەکێکی تر دەڵێ: "بۆی هەیە جاری داهاتوو نۆرەی تۆ بێت."

چیزوکو گێڕایەوە، هەرە ناخۆشترین شت ئەوەیە، نەیزانیوە مێردەکەی لەکوێیە. یەکەمین شەو دوای دەسگیرکردنی مێردەکەی، زەندەقچووانە لەخەو ڕاپەڕیوە، بیری نەهاتووەتەوە بۆچی بەتەنیا ڕاکشاوە. دەستی ڕایەڵ کردووە و هەستی بە جێگەخەوە چۆڵەکەی لایەوە کردووە و لە فیکرەوە چووە: *من خەون دەبینم، ئەمە مۆتەکەیە، بەڵام نا، ڕاستییە.* بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەستاوە، بە ماڵەکەدا هاتووە و چووە و هاواری مێردەکەی کردووە و لە دۆڵاب و ژێر سیسەمەکاندا بەدوایدا گەڕاوە. گوتوویەتی: *ئەی ئەگەر نەیدۆزمەوە.* کاتێک جانتای سەفەرەکەی بینیوە، کە لەلای دەرگەی حەوشەوە دانراوە، کێکێکی شوکولاتی دەر هێناوە و خاوەخاو خواردوویەتی. بە خۆی گوتووە: جانتاکەی بیر چووە. یومیکو دوو جاران مێردەکەی لە خەونندا بینیوە و پێی گوتووە، کە زۆر باش دەرەقەت هاتووە. ژنەکەی دەڵێ: "تەنها سەگەکەیەتی کە زیاتر بۆی نیگەرانە. بە سەعات لەسەر نەعلەکانی ڕادەکشێ و هەر کە هەوڵ دەدەم لەسەر کورسییەکەی دانیشم، پێم دەمرێنێ." فوساکو دانی بەوەدا نا، کە هەرکاتێک دەبیستێ کەسێکی تر، جگە لە مێردەکەی، بێسەروشوێن کراوە، بە نهێنی هەست بە ئاسوودەیی دەکا. دەڵێت: "بەس نییە ژنەکەی ئەوە و من نیم." هەڵبەت پاشان بۆ ئەوە هەر

زۆر شـەرمەزار دەبێ. كانوكو پێ لـەوە دەنێ، كـە ئـەو هـەر هیچ بیری مێردەكـەی نـاكات. دەڵـێ: "ئاخـر ئـەو وەك پیـاو دەیرەتانـدم و سـاڵانێكە هـەر خەریكی دووگیانكردنمـە." كیسـوكو دەڵێ، تا ئەو جێگەیـەی دەزانـێ، نـاوی مێردەكـەی لـە لیستەكەدا نییە. دەڵـێ: "ئـەو جووتیـارە. گوڵـی خۆش دەوێ. هیـچ مەیلێكی ئازاردانی كۆمەڵگەی تێدا نییـە." نوبوكو دەڵـێ: "بـا، كـێ چوزانێت." ئێمـە، ئەوانـی تـر، دەسـتمان لەسـەر دڵمـان و چاوەڕێیـن بڵێی پاشـان چـی چاوەڕێمـان بـێ.

ئێسـتا هەسـت دەكەیـن قـەت ئەوەنـدە لـە مێردەكانمانـەوە نزیـك نەبوویـن. لـە كاتـی فراڤینـدا، باشـترین پلەگۆشـتیان بـۆ دادەنێیـن. وا دەنوێنین ئاگامـان لـێ نییـە كاتـێ خواردنەكە لـە دەمیان دەوەرێت. جێێی قوڕاوییەكانیان لەسـەر ئەرزەكە دەسـڕین، بەبێ ئـەوەی هیچیان بەچاودا بدەیـن. شـەوان لەسـەر تەختەخەوەكـە ڕوویـان لـێ وەرناگێڕیـن. ئەگـەر بەسـەرماندا بقیژێنـن كـە حەمامەكەمـان بـەو جۆرە بـۆ ئامـادە نەكـردوون كـە ویسـتوویانە، یـان ئەگـەر شـێتگیر ببـن و شـتی ناخـۆش بڵێـن: *بیسـت سـاڵە لـە ئەمەریكایت و تاقە شتێك كـە دەتوانیت بڵێیت "Harro"ە؟* ئـەوا ئێمـە زوبانـی خۆمـان دەگریـن و هـەوڵ دەدەیـن تـوورە نەبیـن. چونكـە بیـر بكـەوە، بزانـە چ دەبـێ ئەگـەر بـۆ سـبەی بەیانـی لەخـەو هەسـتین و ئـەوان لـە ماڵـەوە نەبـن؟ ئـەدی چـۆن خـواردن بـۆ منداڵەكانمـان دابیـن بكەیـن؟ چـۆن كرێـی خانووەكانمـان بدەیـن؟ *سـاتوكو ناچـار بـووە هـەر هەمـوو مۆبلەكانـی بفرۆشـێت.* ئەگـەر مێردەكانمـان بگیرێـن، ئـەدی كـێ نیوەی شـەو مقەڵـی ئاگـر لـە دەرەوە دادەنـێ، تـا دارمێوەكان لـە زوقمـی نـاكاوی بەهـار بپارێزێت؟ ئـەدی كـێ قولاپـی شـكاوی تەراكتۆرەكـە چاك دەكاتـەوە؟ كـێ پەیینەكـە تێكـەڵ دەكا؟ كـێ گاسـنەكە پۆڵیش دەكا؟ كـێ

---

* Harro: مەبەست لە (hello)ی ئینگلیزییە، ژاپۆنییەكان ناتوانن پیتی (L) وەك خۆی گۆ بكەن؛ بە (R) گۆی دەكەن. و.ك.

ئارامـمـان دەکاتـەوە، کاتێک کەسێک لـە بـازاڕ بێەدەبانـە مامەڵەمـان دەکا یـان لـە جـادە بـە ناوێکـی نـزم بانگمـان دەکات؟ کـێ دەمانگـرێ و ڕامـان دەوەشێنێ، کاتێ پێ بـە ئەرزەکـەدا دەکوتین و پێیـان دەڵێین، کـە ئیـدی گەییوەتـە سـەر کەپوومـان، کـە لـە خەیاڵـی ئەوەدایـن جێتـان بهێڵیـن، کـە نیازمـان وایـە سـوار یەکەمیـن کەشتی ببیـن و بگەڕێینـەوە وڵاتەکەمـان؟ پێیـان بڵێیـن تاقـە هۆکارێـک کـە ئێـوە ئێمەتـان کـردە هاوسـەری خۆتـان، ئـەوە بـوو دەتانویسـت لـە بێسـتانەکاندا بمانڕەتێنـن.

ئێسـتا ئیـدی ئێمـە زیاتـر و زیاتـر خانەگومـان دەبیـن لـەوەی کـە سیخوڕمان لـە ناودایـە. وا بـڵاو بۆتـەوە، مێردەکـەی تێروکـو سـەرکارێکی لـە کارگـەی سێووشـککردنەوە بـە گـرت داوە، کـە جارێـک لـە جـاران پەیوەندییەکـی لەگـەڵ ژنەکەیـدا هەبـووە. مێردەکـەی فومینـو لەلایـەن شـەریکە دوکانەکـەی پێشـوویەوە، کـە ئێسـتا نائومێدانـە پێویسـتی بـە پارەیـە، خەبـەری لـێ دراوە، گوایـە دەسـەڵاتی میحـوەر بـە کرێـی گرتـووە. (بیستوومانە دەڵێن هـەر سیخوڕێک بیستوپێنج دۆلار بۆ لە زمانەوەدانـی هەرکەسێک وەردەگرێ). مێردەکـەی کونیکـو خەبـەری لـێ دراوە، گوایـە ئەندامـی (بلاک دراگـون سوسـایتی)یە و ئەوەشـی خەبـەری لـێ داوە، کـەس نییـە جگـە لـە کونیکـو خـۆی. دەڵێـن: خەریـک بـووە لەبـەر عەشـیقەکەی، دەسـبەرداری ژنەکـەی ببـێ. هاوسـێکانی دەڵێـن: ئـەدی کابـرای کـۆری، مێردەکـەی ڕوڕیکـو؟ بـە نهێنـی ئیشـی دەکـرد. پـارەی لـە دەوڵـەت وەردەگـرت، تـا چاوێکـی لەسـەر ئەندامانـی پەرسـتگە لۆکاڵییـە بوداییەکـە بێـت. مـن خـۆم بینیـم نـاوی سـەر تابلۆکانـی شـوێنی ترومبێلڕاگرتنەکـەی یادداشـت دەکـرد. چەنـد ڕۆژێـک لەوەوبـەر، لـە چاڵێکـی قـەراغ ڕێگەکـەدا دۆزراوەتـەوە، کـە خـەراپ بیـراز کـراوە، ڕۆژی دواتـر خـۆی و خێزانەکـەی دیـار نەمـاون. دەرگـەی حەوشـەی ماڵەکەیـان لەسـەر پشـت بـووە، تازەکـی پشـیلەکانی خـۆراک درابـوون، قابلەمەیەکـی پـڕ لـە ئـاوی گـەرم هێشـتا

لەسەر تەباخەکە کولاوە. ئیدی ئاوها، ئەوان دیار نەمان. بەڵام دوای چەند ڕۆژێک پروپاگەندە گەییە گوێمان، کە لەکوێ گیرساونەتەوە. دەگوترێ: بەرەو خوار، لای باشوورەوە. بۆ شارەکەی هاوسێمان گواستوویانەتەوە. لە خانوویەکی خۆشدا دەژین و ترومبێلێکی هەر تەواو نفتونوێیان هەیە و سەرچاوەیەکی داراییشیان ئاشکرا نییە.

بەهار دێت. دارباپامەکان دوایین پەڕی گوڵەکانیان دەوەرێنن و دارگێلاسەکان هەر ئێستا لەوەدان چرۆ بکەن. هەتاو لە میانەی پەلکی دارپرتەقاڵەکانەوە بەخوڕ دەیدا لە زەوی. چۆلەکەکان لەناو گژوگیاکەدا خشوهوڕیانە. ڕۆژ دوای ڕۆژ ژمارەیەکی زیاترمان بێسەروشوێن دەبن. هەوڵ دەدەین خۆمان مەژوڵ بکەین و سوپاسگوزاری شتە گچکەکان بین. بۆ نموونە: سەرلەقاندنێکی میهرەبانانەی جیرانێک؛ دەفرێک برنجی گەرم؛ پسوولەیەکی پارەی لە-کاتی-خۆیدا-دراو؛ خەواندنێکی دڵنیایانەی منداڵەکان. هەموو بەیانییەک لەخەو هەڵدەسین و جلکەکانی ئیش لەبەر دەکەین، دەکێڵین و دەچنین و دەجنین. لە ڕەزەکانماندا گژوگیا بژار دەکەین. کەدووەکان و پۆلکەکانمان ئاو دەدەین. هەفتەی ڕۆژێک، ڕۆژانی هەینی، قژمان شانە دەکەین و بۆ شار، بۆ بازارکردن دەڕۆین، بەڵام کە لەسەر جادە یەکتر دەبینین، چاکوچۆنی لەگەڵ یەکدا ناکەین. ئاخر دەترسین ڕەنگبێ وا بنوێنین شتی نهێنی ئاڵوگۆڕ دەکەین. لە گەڕەکە ژاپۆنیینشینەکاندا بەدەگمەن لەدوای خۆرئاوابوون و بە هۆی بڕیاری قەدەغەکردنی هاتووچۆوە، سەردانی یەکدی دەکەین. دوای نوێژ بەنگ نابین. ئێستا هەر کە لەگەڵ کەسێکدا قسە دەکەم، پێویستە لە خۆم بپرسم: ئایا بڵێی ئەمە ئەو کەسە نەبێ، کە لە زمانمەوە دەدا؟ لە بەردەم منداڵە گەنجترەکانمانا ئاگامان لە دەممانە. ئاخر مێردەکەی چیکو لەلایەن کوڕە هەشت ساڵانەکەیەوە لە زمانەوە دراوە. هەندێکمان تەنانەت لە مێردەکانیشمان کەوتووینەتە گومانەوە. دەڵێین: بڵێی شتێکیان

لەبن سەردا نەبێ و ئێمە نەزانین؟

خێرا حەکایەت لەبارەی هەموو ئەو گروپانەوە دەبیستین، کە ڕاپێچ کراون. زیاتر لە سەدا نەوەدی مێردەکانمان لە شارێکی بچووکی کاهووچێنی دۆڵێکەوە بۆ باکوور ڕاگوێزراون. زیاد لە سەد کەس لە مێردەکانمان لە ناوچەکانی بەرگریی دەوروبەری فڕۆکەخانەکان دوور خراونەتەوە. بەرەو خوار لە باشووریش، لە وێرانەئاواییەکی ماسیگران لە کەنار زەریا، هەر هەموو ئەو کەسانەی بە خوێی چێشت پێمان دەگەنەوە، بەبێ چ ئاگادارکردنەوەیەک و لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا کۆ کراونەتەوە و بەکۆمەڵ دەستبەسەر کراون. دەست بەسەر دەفتەری حیساباتەکانیاندا گیراوە. بەلەمی ڕاوە ساردینەکانیان خراونەتە ژێر چاودێرییەوە، تۆڕی ماسیگرتنەکانیان هەلاهەلا کراون و فڕێ دراونەتە ناو زەریا. چونکە ئیخباری کراون، گوایا ئەوانە ماسیگری ڕاستەقینە نین، بەڵکوو ئەفسەری نهێنیین لە ئوستوڵی ئیمپراتوریی دوژمندا. دەڵێن: جلکە سەربازییەکانیان کە لە کاغەزی نایلۆنەوە پێچرابوون، لەبنی ئەو سندوقانەدا دۆزراونەتەوە، کە چەشەی ماسیی تێدا بووە.

هەندێکمان دەچین بۆ بازاڕ و بەو خەیاڵەوەی کە وا خەریکە نۆرەمان لە لیستەکەدا دەگاتە سەر کیسەخەو و جانتای سەفەر بۆ منداڵەکانمان دەکڕین. هەندێکی ترمان وەک جاران لە ئیشوکاری خۆمان بەردەوام دەبین و هەوڵ دەدەین پارێزگاری بە ئارامیی خۆمانەوە بکەین. *پێت وا نییە ئووتووکردنی زیاتری ئەم ئێخەیە جوان بێ؟* بە خۆمان دەڵێین: هەرچی دەبێ با ببێ و چ خایلەیەک بۆ بەرەنگاربوونەوەی خوداکان نییە. یەکێکمان واز لە قسەکردن دێنێ. یەکێکی ترمان بەیانییەک زوو دەڕوا تا ئاو بداتە ئەسپەکان، خۆی لە کادانەکەدا هەڵدەواسێ. فوبوکی ئەوەندە زەندەقی چووە، کاتێ دواجار فەرمانی ڕاگواستنەکە دێت، هەناسەیەکی ئاسوودەیی هەڵدەکێشێ، ئاخر ئیدی چاوەڕوانییەکەی

کۆتایی هاتووە. ناباوەڕانە زەق زەق لە بڕیارەکە دەنۆڕێ و بەبێدەنگی سەر ڕادەوەشێنێ. دەپرسێ: "بەڵام ئاخر چ بەسەر شیلکەکانماندا دێت؟ دیارە سێ هەفتەی تر دەڕنرێن." ماچیکو دەڵێ بەنیاز نییە کۆڵ بدا، تەنها هەر ئەوەندە. "ئاخر تازە گرێبەستی کرێی ڕێستۆرانەکەیان نوێ کردۆتەوە." یومیکو دەڵێ چ ڕێگەچارەیەکی ترمان نییە جگە لەوەی بەو جۆرە بکەین، کە پێمان گوتراوە". دەڵێ: "ئەوە فەرمانی سەرۆکە. ئەدی ئێمە چۆن دەتوانین گومان لە سەرۆک بکەین؟" مێردەکەی تاکیکو دەیەوێ بزانێ زەوی لەوێ چۆنە. چەند ڕۆژمان هەتاو دەبێ؟ چەند ڕۆژمان باران دەبێ؟ کیکو تەنها دەست بەیەکدا دەدا و سەر دادەگرێ و تەماشای بەرپێی خۆی دەکا. بەکاوەخۆ دەڵێ: "هەموو شت تەواو." هارویو دەڵێ بەس نییە لانی کەم لێدەگەڕێن پێکەوە بڕۆین. هیساکو دەڵێ: "ئا، بەڵام چیمان کردووە؟" ئیسنو بە ڕوومەتی خۆیدا دەکێشێ و دەگری: "خۆزگە چەند ساڵێک لەمەوبەر لە مێردەکەم جیا ببوومایەتەوە و منداڵەکانم بۆ ژاپۆن بۆ لای دایکم بناردنایەتەوە."

یەکەم جار پێمان دەڵێن بۆ چیامان ڕادەگوێزن، بۆیە ئاگادار بین جلکی گەرم لەبەر بکەین، ئەوێ هەر زۆر زۆر ساردە. ئەوسا دەچین بۆ بازاڕ و دەرپێی خووری درێژی ژێرەوە و یەکەمین پاڵتۆی گەرمی زستانمان دەکڕین. پاشان دەبیستین بەرەو بیابانمان ڕادەگوێزن، کە لەوێ ماری ژەهراویی ڕەشی لێیە و مێشوولەکانی هێندەی زەڕنەقووتەیەک دەبن. دەڵێن: لەوێ هیچ پزیشکێک نییە و دەڤەرەکە جمەی دێت لە دز. ئەوسا دەچین بۆ بازاڕ و قوفڵ و پاکەتی ڤیتامینات بۆ منداڵەکانمان دەکڕین، پاکەتی لەفاف و مەرهەم، پلاستەری پزیشکی، ڕۆنگەرچەک، یۆد، ئەسپیرین و لەفافی تۆڕی دەکڕین. دەبیستین دەبێ تەنها جانتایەک شت لەگەڵ خۆماندا ببەین، بۆیە کۆڵەپشت لە قوماش بۆ منداڵە ناوەنجییەکانمان دەدوورین و لەسەر هەریەکەیان ناویان دەچنین.

قەڵەم و دەفتەر، فڵچەی ددان، کراس، زەرفی کاغەزی قاوەیی پڕ لە برنج، کە لەبەر هەتاو و لەسەر سینیی تەنەکە وشکمان کردوونەتەوە، لە کۆڵەپشتەکانیان دەنێین. پێیان دەڵێین: "ئەگەر لەیەک دابڕاین، ئەوە تەنها بە شێوەیەکی کاتی دادەبڕێین" پێیان دەڵێین هیچ خەمیان نەبێت. باسی هەموو ئەو شتانەیان بۆ دەکەین، کە کاتێ بۆ ماڵەوە دەگەڕێینەوە، دەیانکەین. پێیان دەڵێین کە گەڕاینەوە، هەموو ئێوارانێک لە بەردەم ڕادیۆکەدا فراڤین دەکەین. بۆ سینەمایان لە ناوەندی شار دەبەین. بۆ سێرکە دێوەرەکەیان دەبەین و تەماشای جمکە پێکەوەلکاوەکە و ئەو خانمە دەکەین، کە گچکەترین سەری لە دونیادا هەیە. ئەو خانمەی سەری لە هەڵوژەیەک گەورەتر نییە!

چرۆی سەوزی کاڵ لە ڕەزەکاندا، لە پەلکی مێوەکان دەپشکوێن و لە تەواوی دۆڵەکەدا دارقۆخ لەژێر ئاسمانێکی شینی ڕووندا شکۆفە دەکا. هەوری گوڵەخەرتەلەی کێویلە لە گەلییەکاندا بە زەردێکی بریقەدار پرشنگ دەدا. کلاوکوڕە لە یالەکان هەڵدەفڕنە خوارەوە. لە شاری دوور و گوندەکاندا کوڕ و کچە گەورەکانمان یەک لەدوای یەک واز لە ئیش و قوتابخانەکانیان دێنن و بۆ ماڵەوە دەگەڕێنەوە. یارمەتیمان لە دۆزینەوەی کەسانێکدا، کە بتوانن لە گەڕەکە ژاپۆنییەکاندا ئاگایان لە وشکەشۆییەکانمان بێت، دەدەن. یارمەتیمان دەدەن لە دۆزینەوەی کرێگرتەی نوێ بۆ ڕێستورانەکانمان. یارمەتیمان دەدەن لە هەڵواسینی تابلۆ لە دوکانەکانماندا کە لێمان نووسیون: ئێستا بکڕە! پاشەکەوت بکە! پێویستە هەر هەموو شمەکەکانی ئەمبارەکە بفرۆشرێن! بەدلەکانیان لەبەر دەکەن و بۆ دوایین جار لە درەو و کۆکردنەوەی بەروبوومدا یارمەتیمان دەدەن، لەبەر ئەوەی فەرمانمان پێ کراوە تا دوایین نەفەس کێڵگەکانمان بکێڵین. پێمان دەڵێن ئەوە بەرخۆدانی ئێمەیە لە جەنگەکەدا. دەرفەتێکە تا وەفادارێتی خۆمان بسەلمێنین، ڕێگەیەکە تا میوە و

سەوزەوات بۆ بەرەی ناوخۆ دابین بکەین.

ئاسنەواڵەفرۆشەکان بەکاوەخۆ لۆرییەکانیان بەدرێژاییی جادە تەسکوتروسکەکانی گەڕەکەکانماندا لێدەخوڕن و بانگهێشتمان دەکەن تا شمەکەکانمانیان پێ بفرۆشین. تەباخێکی تازە بە دە دۆلار، کە ساڵی پار بە دوو سەد کڕیومانە. سەلاجەیەک بە پێنج دۆلار. لەمپایەک بە پێنج سەنت. دەرودراوسێگەلێک، کە قەت یەک وشەمان لەگەڵ یەکدیدا نەکردووە، دێن بۆ لامان بۆ کێلگە و پرسیارمان لێ دەکەن ئاخۆ هیچمان نییە بمانەوێ فڕێی بدەین. ڕەنگبێ گاسنەکەمان؟ ئەی ئەو شەنە؟ ئەو ئەسپی کێلانە؟ ئەو گاسنە گەورەیە؟ ئەو تەلانی کوێن ئانێ – ئەو سوورەگوڵەی باخچەکانمان، کە ساڵانێکە چاویان تێ بڕیبوو. خەڵکی غەریبە لە دەرگەی ماڵەکانمان دەدەن، پیاوێک لێمان دەپرسێ: "سەگتان هەیە؟" ڕوونی دەکاتەوە کوڕەکەی هەر زۆر حەز دەکات توولەیەکی هەبێت. پیاوێکی تر دەڵێ کە بە تاقیتەنیا لە ماڵەواگۆنێکدا لە نزیک کارخانەی کەشتیسازییەکەدا دەژی و بە خۆشحاڵییەوە حەز دەکا پشیلەیەک بکڕێت. دەڵێ: "هەڵبەت وەک دەزانن، تەنیایی زەحمەتە." جاروبار شتەکانمان خێرا بە هەرچەندێک بێ، دەفرۆشین، جاری تر هەرە ئازیزترین گوڵدان و قۆری چاکانمان لەدەست دەبنەوە و هەوڵ دەدەین زۆر خەفەتیان بۆ نەخۆین، لەبەر ئەوەی دایکانمان هەمیشە ئامۆژگارییان کردووین: بنیادەم نابێ ئێجگار زۆر بە شتی ئەم دونیایەوە بنووسێت.

کاتێ وادەی ڕاپێچکردنمان نزیک دەبێتەوە، دوایین قەرزەکانمان دەدەینەوە و سوپاسی مشتەرییە بەوەفاکانمان دەکەین، کە تا کۆتایی پاڵپشتمان بوون. سوپاسی هێنریتا، ژنەکەی شەریف بورکهارد، کە هەموو هەینییەک پێنج بەرچنە شیلک لە مێزی میوەفرۆشییەکەمان دەکڕێ و پەنجا سەنتیشمان وەک بەخشیش دەداتێ و دەڵێ: فەرموو،

بیگرە و شتێکی جوانی بۆ خۆتان پێ بکڕن. سوپاسی تۆماس دوفی، ئەو خانەنشینە بێوەیە، کە هەموو ڕۆژێک سەعات دوازدە و نیو بۆ دوکانی ماکەڕۆنییەکەمان دێت و دەفرێک مریشک بە برنجی سوورەوەکراوەوە داوا دەکا. سوپاسی بەڕێوەبەرەکە لە لادیس ئاوکیسیلێری کلوب، (ڕۆسالیند ئەندرێس)، کە وشکەشۆییەکەی نەدایە کەسی تر. دەڵێ: هەر زۆر سووک و هاسان چینییەکان لە قەرەی ئەوە نایەن. بەردەوام دەبین لە ئیشکردن لە کێڵگەکانماندا و بەو جۆرە دەکەین، کە هەمیشە دەیکەین، بەڵام هەست ناکەین هیچ شتێک ڕاستەقینە بێت. سندوق بۆ ئەو بەروبوومانە دروست دەکەین، کە چیدی هەرگیز نەماندەڕنین. نقورچ لەو چرۆی مێوانە ناگرین، کە تا دوای ڕۆیشتنی ئێمە ناپشکوێن. زەوییەکەمان نەرم دەکەین و شەتڵی تەماتەکانمانی تێدا دەنێژین و تاوەکوو هاوینێکی درەنگ، کاتێ چیدی ئێمە لێرە نین، پێبگەن. ئێستا ڕۆژەکان درێژ و هەتاوین. شەوەکان فێنکن. ئەمبارەکانی ئاو پڕن. نرخی بەزالیای شیرین بەرزە. گیامارانە لە وەرزی بە هەرمێنی خۆی نزیک دەبێتەوە. شیلک بەسەر پەلکەکانەوەیە و بەو زووانە دارهوڵو لە بیستانەکاندا قورس دەبێ بە بەر. دەڵێین: هەفتەیەکی تر نابا بۆ خۆمان دەوڵەمەند دەبین. ئەگەرچی دەزانین بەو زووانە دەڕۆین، بەڵام بەردەوام ئاوات دەخوازین شتێک ڕوو بدات و نەڕۆین.

ڕەنگبێ کڵێسا بە ناوی ئێمەوە دەخاڵەتێک بکا، یان ژنی سەرۆک، یاخود ڕەنگە بەدحاڵیبوونێکی ترسناک ڕووی دابێ، بەوەی هەر بەڕاستی ئەوە کەسانێکی تر بن، کە بیر لە ڕاگواستنیان کرابێتەوە. یەکێک دەڵێ: "ڕەنگە ئەڵمانەکان بن!" یەکێکی تر دەڵێ: "یان ئیتاڵییەکان!" یەکێکی تریش دەڵێ: "بەڵام ئەی چینییەکان؟" خەڵکێکی ترمان بێدەنگ دەبین و خۆمان بۆ سەفەرەکە ئامادە دەکەین. جواب بۆ مامۆستای منداڵەکانمان دەنێرین و بە ئینگلیزییە سەروگوێلاک-شکاوەکانمان داوای لێبووردنیان

بۆ ئەو دیارنەمانە ناکاو و چاوەڕواننەکراوەی منداڵەکانمان لە قوتابخانە لێ دەکەین. ڕێنومایی‌گەل بۆ بەکرێگرتەکەی دوای خۆمان دەنووسین و بۆی ڕوون دەکەینەوە، کە چۆن بۆریی شکاوی دووکەڵی سەر ئاگردانەکە چاک بکاتەوە و چ لەگەڵ کونی ساپیتەکەدا بکا. هەر زۆر سووک و هاسان سەتڵێک بەکار بهێنێ. گوڵی لۆتس بۆ بودا لە دەرەوەی پەرستگەکانمان دادەنێین. بۆ دوایین جار سەردانی گۆڕستانەکانمان دەکەین و ئاو دەکەین بە بەردەکێلی گۆڕی ئەو کەسانەدا، کە ئەم دونیایەیان جێ هێشتوون. گۆڕی تێتساو، کوڕە گەنجەکەی یوهایی، کە گایەکی هار بە قۆچ کوشتی. گۆڕی کچی چایچییەکەی خەڵکی یوکوهاما، کە بەحاڵ ناوەکەیمان بیر دێتەوە. پێنج ڕۆژ دوای ئەوەی لە کەشتییەکە دابەزی، بە پەتای ئیسپانیایی مرد. بۆ دوایین جار لەگەڵ مێردەکانماندا، کە دان بە خۆیاندا ناگرن و دوایین گژوگیا هەڵدەکێشن، بە ڕیزەمێوەکانماندا دێین. پەلکە شۆڕەوەبووەکان بە داربایامەکانەوە ڕاگیر دەکەین. کرم لە کێڵگەی کاهووەکانماندا دەدزۆینەوە و بە دەست دەیانکەین بەژێر ئەرزە ڕەشە تازەکی نەرمکراوەکەوە. بە دوایین جلک لە جلکشۆرییەکانماندا ڕادەگەین، هەموو دەریچەی دوکانەکانمان دادەخەین، ئەرزەکانمان گسک دەدەین، جانتاکانمان دەپێچینەوە، منداڵەکانمان کۆ دەکەینەوە و لە هەموو گوندێک و لە هەموو دۆڵێک و هەموو شارێکەوە، بەدرێژاییی کەنار، بەڕێ دەکەوین.

گەڵای درەختەکان هێشتا هەر لەبەر بادا دەلەرنەوە. ڕووبارەکان هێشتا هەر خوڕەیان دێ. مێرووەکان وەک جاران لە گژوگیاکەدا دەسووڕێنەوە. قەلەڕەشەکان دەقاژێنن، ئاسمان دانارمێ. سەرۆک ڕای خۆی ناگۆڕێ. مریشکە ڕەشە لەبەردڵانەکەی میتسوکو یەک جار دەگارێنێ و هێلکەیەکی گەرم و قاوەیی دەکا. هەڵۆژەیەکی سەوز پێشوەخت لە درەختێکەوە دەکەوێتە خوارەوە. سەگەکەمان تۆپەکان بە

دەمیانەوە، ڕادەکەن و تامەزرۆی دوایین تۆپهەڵدانن، ئێمەش بۆ یەکەمین جار ناچار دەبین دەریان بکەین. دەڵێین: *دەی بۆ ماڵەوە!* دەرودراوسێ لە پەنجەرەکانیانەوە بە سەرەتاتکێوە تەماشامان دەکەن. ترومبێلەکان هۆڕنمان بۆ لێدەدەن. ڕێبواران زەق زەق تەماشامان دەکەن. کوڕێک بەسەر پاسکیلەوە دەستیمان بۆ ڕادەوەشێنێ. کاتێ تالانکەران لە دەرگەی حەوشەوە خۆیان بە ژووردا دەکەن، پشیلەیەکی زەندەقچوو لەژێر سیسەمی ماڵێکمانەوە فرتە دەکا. پەردەکان دەدڕێندرێن. شووشە و پەرداخ دەشکێندرێن. کاسەی بوکێنی فڕێ دەدرێتە سەر ئەرزەکە. ئێمەش دەزانین کە ئەوە سەرەتایە و ئیدی لەوەبەدوا سەرلەبەری شتەکانمان دیار نامێنن.

# دوایین ڕۆژ

هەندێکمان کە ڕاپێچ دەکرێین، دەگرین و هەندێکی ترمان گۆرانی دەڵێین. یەکێکمان دەست دەنێتە سەر زاری و قاقایەکی هیستریایانە لێدەدا. تاقمێکمان بەسەرخۆشی بەڕێ دەکەوین. تاقمێکی ترمان بەبێدەنگی و بە سەرێکی نەوی و شەرمەزار و خەجاڵەتبار بەڕێ دەکەوین. پیرەمێردێکی خەڵکی گیلوری لەسەر دەستەبەرەیەک بەڕێ دەکەوێ. پیرەمێردێکی تر – مێردی ناتسوکو، کە سەرتاشێکی خانەنشینی خەڵکی فلورینە – بە کڵاوێکی جەنگاوەرانی دێرینی ئەمەریکاییەوە بەڕێ دەکەوێ، کە تەواو بە سەریدا دایداوەتەوە و دەڵێ: "کەس لە جەنگدا نایباتەوە. هەر هەموو دەدۆڕێن." کە بەڕێ دەکەوین، زوربەمان تەنها بە ئینگلیزی قسە دەکەین، تا ئەو حەشاماتە نەورووژێنین، کە کۆ بوونەتەوە و تەماشامان دەکەن. زوربەمان هەموو شتمان لەدەست داون و بەبێ ئەوەی هەر هیچ بڵێین، بەڕێ دەکەوین. هەموومان بەو کاغەزی ناسینەوە سپیانەوە ڕاپێچ دەکرێین، کە بە ملیوانە و بەرۆکی پاڵتۆکانمانەوە کراون. ساوایەکی تازە لەدایکبووی خەڵکی سان لیاندرو، خەواڵوو و بە چاوانێکی نیوەلێکێندراوەوە، لە زەمیلەیەکی-بە-پەلکی داربی-چنراودا و بە ڕاژەنینەوە، بەڕێ دەکەوێ. دایکی ساواکە – نائومی، کچە گەورەکەی شیزوما – زەندەقچوو، بەڵام شیک و ڕێکپۆش، بە تەنوورەیەکی خوری و پیلاوی ڕەشی پاژنەبەرزی چەرمی تیمساحەوە بەڕێ دەکەوێ و

لیکدالیکداش پرسیار دەکا: "ئەرێ پێتان وایە لەوێ شیر هەبێت؟" کوڕێکی خەڵکی ئۆکسنارد، بە پانتۆڵی کورتەوە و بەو خەیاڵەوە بەڕێ دەکەوێ، کە ئاخۆ بڵێی لەوێ جۆلانە هەبێت. هەندێکمان بەهەرە جوانترین جلکەکانمانەوە ڕاپێچ دەکرێین، هەندێکی ترمان بەو تاقە جلکانەوە کە هەمانە، ڕاپێچ دەکرێین. ژنێک بە فەرووی ڕێوییەوە بەڕێ دەکەوێ. خەڵک بە چرپە دەڵێن: ئەوە ژنی *پادشای کاهووە*. پیاوێک بە پێی پەتی بەڵام بە سەر و ڕیشی تاشراوەوە بەڕێ دەکەوێ و هەموو شتەکانی بەجوانی لە پارچەقوماشێکی سپییەوە دەپێچێ: تەسبیحێکی بودایی، کراسێکی پاک، دوو زاری بەخت، جووتێک گۆرەوی تازەکە دەکرێ کاتێ وەزع باش دەبێ ،لەپێی بکا. پیاوێکی خەڵکی سانتا باربارا بە جانتایەکی سەفەری چەرمی قاوەییەوە بەڕێ دەکەوێ، کە کاغەزی چەسپی بریسکەداری پێوە لکێندراوە و لێی نووسراوە: *پاریس* و *لەندەن* و *هۆتێل میترۆپۆل* و *بایروس*. ژنەکەی سێ هەنگاو لەدوایەوە دەڕوا و تەختەیەکی جلکشۆری و کتێبێکی ئەتەکێتی ئیمیلی پۆست، کە لە کتێبخانە خواستوویەتی، هەڵگرتووە. دەڵێ: تا هەفتەی داهاتوو کات بۆ بردنەوەی ماوە. خێزانگەلێکی خەڵکی ئۆئەکلاند بە گونییەی تۆکمەوە بەڕێ دەکەون، کە ڕۆژێک پێشتر لە (مۆنتگوامەری وارد) کڕیویانە. خێزانگەلێکی خەڵکی فریسنو بە کارتۆنی هەڵاوساوی مقەباوە بەڕێ دەکەون. (تاناکا)ی ژن و مێردی خەڵکی گاردێنا بەبێ ئەوەی کرێی خانووەکەیان بدەن، بەڕێ دەکەون. تاناکای ژن و مێرد، خەڵکی دیلانۆ، بەبێ ئەوەی باجەکەیان بدەن، بەڕێ دەکەون. کوبایاشی ژن و مێرد، خەڵکی بیولا، دوای ئەوەی تەباخەکەیان بە ئاوی پاک دەشۆن و زەویی ڕێستورانەکەیان بە فلچە و ئاوی لەکوڵ دەسڕن، بەڕێ دەکەون. سوزوکی ژن و مێرد، خەڵکی لومپوک، تۆپەڵێکی بچووک خوێ لە بەردەرگەی حەوشەکەیاندا دادەنێن، تا ماڵەکەیان پاک بێت. (نیشیموتو)

ی ژن و مێرد، خەڵکی سان کارلوس، چەند دەفرێکی پڕ لە میوەی تازەی بێستانەکەیان لەسەر مێزی موبەقەکەیان بۆ ئەو کەسانە دادەنێن، کە دوای ئەمان بۆ ماڵەکە دەگوێزنەوە. ئیگاراشی ژن و مێرد، خەڵکی پرێستون، لە دوایین لەحزەدا خۆیان کۆ دەکەنەوە و کە بەڕێ دەکەون، تێکەڵپێکەڵییەک لەدوای خۆیانەوە جێ دێڵن. زوربەی زۆرمان بەپەلە راپێچ دەکرێین. زوربەمان بە شپرزەیی ڕاپێچ دەکرێین. هەندێکمان بە قێزلێهاتنەوەوە ڕاپێچ دەکرێین و چ ئارەزوویەکمان نابێ، کە قەت بگەڕێینەوە. یەکێکمان دوورگەی ڕۆبێرت لە دێلتا بە نوسخەیەک ئینجیلەوە جێ دێڵێ، کە توند توند بە خۆیەوە نووساندوویەتی و لەبەر خۆیەوە دەڵێ: *"ساکورا، ساکورا"* یەکێکمان کە خەڵکی شارە گەورەکەیە، بە یەکەمین پانتۆڵە درێژەکەیەوە بەڕێ دەکەوێ. دەڵێ: *دەڵێن گوایە لەوێ جێگە بۆ جلک نییە.* یەکێکمان دوای ئەوەی بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا قژی لە سالۆنی (تالک ئۆف زە تاون) دەبڕێ، بەڕێ دەکەوێ. دەڵێ: *ئەمە شتێکە، کە هەمیشە ویستوومە بیکەم.* یەکێکمان مەرەزەیەک لە ویلوس، بە موفەڕکێکی بوداییەوە لە گیرفانیدا جێ دێڵێ و هاوکاتیش بە هەمووان ڕادەگەیەنێ: دواجار هەموو شت دەچێتەوە شوێنی خۆی. دەڵێ: "خوداکان چاویان لێمان دەبێ." مێردەکەی بە جلکی قوڕاویی ئیشەوە و لە کاتێکدا هەموو پارەی پاشەکەوتەکەیان دەپەستێنێتە نووکی جزمەکەیەوە، بەڕێ دەکەوێ و دەڵێ: "پەنجا سەنت!" وا دەڵێ و چاو دادەگرێ و زەردەخەنەی دێتێ. هەندێکمان بەبێ مێردەکانمان ڕاپێچ دەکرێین، چونکە ئەوان لە یەکەمین هەفتەکانی هەڵایسانی جەنگدا دەسگیر کراون. زوربەمان بەبێ منداڵەکانمان ڕاپێچ دەکرێین، کە ساڵانێک لەوەوبەر بۆ دوورمان هەناردبوون. *داوام لە دایک و باوکم کردووە چاویان لە دوو نوبەرەکەم بێت، تا بتوانم کاتی تەواو بدەمە* کێڵگەکەم. یەکێکمان وا دەڵێ. پیاوێک، (ئیست فێرست ستریت) لە لۆس

ئەنجلس بە سندوقێکی سپیی داری پڕ لە خۆڵەمیشی ژنەکەیەوە جێ دێڵێ، کە بە پەتێکی ئاوریشم کردوویەتیە ملی. دەڵێ: *بەدرێژاییی ڕۆژ قسەی لەگەڵ دەکا*. پیاوێک بە قووتوویەک شووکولاتەوە هایوارد جێ دێڵێ، کە لەو ژنومێردە چینییە وەری گرتبوو، کە دەستیان بەسەر گرێبەستی دوکانەکەیدا گرتووە. پیاوێک ڕەزێک لە دینوبا بە قۆچێک لە لاکەلەکەی (ئال پیترۆسیان)ی دراوسێیدا جێ دێڵێ، کە کرێی گاسنەکەی نەدابوویێ. دەڵێ: پیاو نابێ قەت متمانە بە ئەرمەن بکا. پیاوێک لەرزان و دەستبەتاڵ و بە قیژەقیژەوە، ساکرامینتو جێ دێڵێ و دەڵێ: "هەر هەموو شتەکان هی ئێوەن!" ئاسایو – جوانترینەکەمان – کە نیو ڕانچ لە (ڕێدوود) جێ دێڵێ، هەمان ئەو جانتایەی پێیە، کە لە داری خورمای هیندی دروست کراوە و پێش بیستوسێ ساڵ کاتێ بە کەشتییەکە دەگاتە ئێرە، پێی بووە. دەڵێ: هێشتا تازە و نفتونۆ دەنوێنێ. یاسوکو باڵەخانەکەی لە لۆنگ بەیچ بە نامەیەک لە پیاوێکەوە جێ دێڵێ، کە نامەی مێردەکەی نابێ، نامەکەی جوان جوان لەنێو شووشەیەک پۆدرەی بنی جانتا دەستییەکەیدا قەد کردووە. ماسایو ڕاپێچ دەکرێ، دوای ئەوەی خواحافیزی لە ماسامیچی کوڕی لە خەستەخانەی سان برونو دەکا، کە لەوێ لە کۆتاییی هەفتەدا بە نەخۆشیی گوێڕەپە دەمرێ. هاناکو بە ترس و کۆکەکۆکەوە ڕاپێچ دەکرێ، بەڵام تاقە شتێک کە هەیەتی، هەڵامەتێکە. ماتسوکو بە ژانەسەرەوە ڕاپێچ دەکرێ. توشیکو بە لەرزوتاوە ڕاپێچ دەکرێ. شیکی بە خەوێکی قووڵەوە ڕاپێچ دەکرێ. میتسویو بە دڵتێکهەڵاتن و دووگیانبوونێکی ناچاوەڕوانکراوی یەکەم جاری ژیانییەوە، لە تەمەنی چلوهەشتساڵیدا ڕاپێچ دەکرێ. نوبویێ ڕاپێچ دەکرێ و بیر لەوە دەکاتەوە، ئاخۆ هەمان ئەو بەیانییە دوای ئووتووکردنی چرچی بلووسەکەی، پلاکی ئووتووەکەی لە سویچەکە دەر هێناوە یان نا. بە مێردەکەی دەڵێ: *"من دەبێ بگەڕێمەوە!"* مێردەکەشی

بەبێ ئەوەی چ وەڵامێک بداتەوە، زەق زەق لەپێش خۆی دەنۆڕێ. تورا بە نەخۆشییەک لە ئەندامی زاووزێیدا ڕاپێچ دەکرێ، کە دوایین شەو لە ویلکەم هۆتێل گیرۆدەی بووە. ساچیکو بە سەعیکردن لە ئەی بی سی دییەکەیدا ڕاپێچ دەکرێ، وەک بڵێی ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی هەر تەواو ئاسایی بێت. فوتایێ، کە لەناوماندا باشترین کەسە خاوەن ئەمباری وشەسازی بێت، لاڵوپات و بە زوبانێکی بەستراوەوە ڕاپێچ دەکرێ. ئاتسوکو دوای ئەوەی خوداحافیزی لە درەخت بە درەختی بێستانەکەی دەکا، بە دڵێکی شکاوەوە ڕاپێچ دەکرێ. دەڵێ: *بە قەڵەم ڕواندوومن.* میۆشی بەدەم بیرکردنی ڕێو، ئەسپە گەورەکەیەوە ڕاپێچ دەکرێ. ساتسویو بەدەم چاوگێڕان بۆ دراوسێکانییەوە، بوب و فلورێنس ئێلدرەیکەوە ڕاپێچ دەکرێ، کە گفتیان داوە بێن و خواحافیزیی لێ بکەن. تسوگینو بە ویژدانێکی ئاسوودەوە ڕاپێچ دەکرێ، دوای ئەوەی بەسەر چاڵاوێکدا و بە هاوارهاوار دان بە نهێنییەکی دزێو و لە مێژەپارێزراودا دەنێ: من خۆم دەمی ساواکەم پڕ کردووە لە خۆڵەمێش و خنکاندوومە. کیونو کێڵگەکەی بەو قەناعەتەوە جێ دێڵێ، کە ئەمە سزای گوناهێکە لە ژیانێکی پێشوویدا کردوویەتی. دەڵێ: هەبێ و نەبێ لاقم بە جاڵجاڵۆکەیەکدا ناوە. سێتسوکو دوای ئەوەی هەر هەموو مریشکەکانی لە حەوشەی دواوە دەکوژێ، ماڵەکەی لە گریدلی جێ دێڵێ. چییا، گلێندال جێدێڵێ و هێشتا لە پرسەی (میسوزو)ی کچەگەورەیدایە، کە پێنج ساڵ لەوەوبەر خۆی فڕێ دابووە بن ترێنێک. سوتیکو، کە خۆی هیچ منداڵی نییە، بەو هەستەوە ڕاپێچ دەکرێ، کە ژیانی بە جۆرێک لە جۆرەکان تێپەڕیوە. شیزویو ئەمباری ژمارە ٨ لە ویب ئیسلاند بە گۆرانی گوتنەوە جێ دێڵێ، سوترایەک دەچڕێ، کە سیوچوار ساڵە بیری نەکەوتۆتەوە، کەچی هەمان ئەو ڕۆژە کەوتبووە سەر زاری. دەڵێ: باوکم بەردەوام هەموو بەیانییەک لەبەر ئەڵتارەکەدا دەیچڕی. کاتسونو دوکانی جلکشۆریی

مێردەکەی لە سان دیگو بە بلمەبلمەوە جێ دێڵێ و دەڵێ: "بێزەحمەت کەس دەتوانێ خەبەرم بکاتەوە." فومیکو لە پانسیۆنێکەوە لە کوارتلاند ڕاپێچ دەکرێ و داوای لێبووردن لە خەڵک بۆ هەر زەحمەتێک دەکا، کە خستبێتییە بەریان. مێردەکەی ڕاپێچ دەکرێ و تکای لێ دەکا کە بێ بەڕێوە و دەمی داخا. میسیو نازدارانە و بەبێ چ کینەیەک بەرامبەر هیچ کەسێک، ڕاپێچ دەکرێ. چیوکو کە هەمیشە تکامان لێ دەکا بە چارلوت بانگی بکەین، کە ڕاپێچ دەکرێ تکامان لێ دەکا کە لەمەولا بە چیوکو بانگی بکەین. دەڵێ: *من بۆ دواجار ڕای خۆم گۆڕی.* ئێۆ بە کاتژمێرێکی خەبەرکەرەوەوە ڕاپێچ دەکرێ، کە لە جێگەیەک لەناو جانتای سەفەرەکەیدا زەنگ لێدەدا، بەڵام ڕاناوەستێ بیکوژێنێتەوە. کیمیکو جانتا دەستییەکەی لەسەر مێزی موبەق لەبیر دەچێ، بەڵام تا زۆر درەنگ نەکا، پێی نازانێ. هاروکوو پەیکەرێکی بچووکی دەمبەخەندەی بودا لە کانزای زەرد، لە سەرەوە لە قوژبنێکی هەورەبانەکەدا جێ دێڵێ، کە تا ئەمڕۆ بودا هەر لەوێ دانیشتووە و هەر دەخەنێ. تاکاکو کیسەیەک برنج لەژێر تەختەی ئەرزیی ژووری موبەقەکەدا جێ دێڵێ، تا خێزانەکەی کە دەگەڕێنەوە، شتێکیان بۆ خواردن هەبێ. میسیایو جووتێک سۆڵی تەختەیی لە هەیوان جێ دێڵێ، تا وا دیار بێت هێشتا کەسێک لە ماڵەوەیە. ڕوکوو ئاوێنە زیوەکەی دایکی لای دراوسێکەیان، لویس هاستینگ جێ دێڵێ، کە گفتی داوە تا دێتەوە، بۆی بپارێزێت. گوتبووی: بەهەر شێوەیەک بتوانم، یارمەتیت دەدەم. ماتسویو بەو ملوانکە مروارییەوە ڕاپێچ دەکرێ، کە (میسز بونتینگ)ی خانەخوێی پێی داوە، ماتسویو ماڵەکەی ئەوی لە واشنتون بۆ ماوەی بیستویەک ساڵی ڕەبەق بریقە لێ دەهێنا. دەڵێ: نیوەی ژیانم. سومیکو بە زەرفێکەوە ڕاپێچ دەکرێ، کە پڕە لە پارەی نەخت و (میستەر هاوێل)ی مێردی دووەمی، کە خەڵکی مونتیکتویە، پێی داوە. ئەو تازەکی سومیکوی

ئـاگادار کـردووە، ناتوانـێ لـە سـەفەرەکەدا لەگەڵـی بێـت، سـومیکوش ئەڵقەکـەی بـۆ گەڕاندۆتـەوە. چیونـو بـە داڵغـەی (جیرو)ی برابچووکییـەوە کولمـا جـێ دێڵـێ، کـە هاوینـی سـاڵی ١٩٠٩ بـۆ تاراوگـەی گـەڕەکان لـە دوورگـەی ئوشیما هەنێردراوە. دەڵێ: چیدی باسیمان نەدەکرد. ئایومی بـەو خایلەیـەوە ئەدینڤیل جـێ دێڵـێ، کـە ئاخـۆ بیـری نەچـووە کراسـی سـووری بەختەکـەی بخاتـە جانتاکەیـەوە. دەڵـێ: بەبـێ ئـەو کراسـە، خـۆم نیم. ناگاکو پڕ لـە ئـازاری قووڵـی ویـژدان بـۆ هەمـوو ئـەو شـتانەی کـە کردوونـی، ئێل کیریتـو جـێ دێڵـێ. دەڵـێ: حـەزم دەکـرد بـۆ دواجـار سـەردانی گوندەکەمانـم کردبـا و بخـوورردم لەسـەر گـۆڕی باوکـم داگیرسـاندبا. (ئیڤلین)ی کچـی، بـە تکالێکردنییەوە ڕاپێـچ دەکـرێ و دەڵـێ: "دایکـە، خێراکـە، خێراکـە، ئێمـە درەنـگ کەوتیـن." ژنێکـی نائاسـاییبیانە جوان، کـە هیچکام لـە ئێمـە نەیبینیـوە، درەوشـاوە و سەرلێشـێواو ڕاپێـچ دەکرێ، خەڵـک دەڵێن مێردەکـەی لـە ژێرزەمینەکەیـدا زیندانیی کردووە، تـا هیـچ پیاوێکـی تـر ڕووخسـاری نەبینێـت. پیاوێکـی خەڵکـی سـان ماتیـو، بـە سیتێکی گۆڵـف و کارتۆنێـک ویسـکی (ئۆڵـد پار)ەوە ڕاپێـچ دەکرێ. کەسێک دەڵێ: بیستوومە ئـەو پیاوە جاران خزمەتکاری شەخسیی چارلی چاپلن بووە. پیاوێـک لـە توێـژی قەشـان – قەشـە شـیباتا لـە فێرسـت باپتیسـت چـورچ – ڕاپێـچ دەکـرێ و بـە پەرۆشـەوە تـکا لـە هەمـووان دەکا، کـە ببوورن و لەبیر بکەن. پیاوێک، کاندای ئاشـپەز – خەڵکـی یابـو نودیل – لـە چاکـەت و پانتۆڵێکـی قاوەیـی بریقـەداردا، ڕاپێـچ دەکـرێ و بەپەرۆشـەوە تـکا لـە قەشـە شـیباتا دەکا، دەمـی داخـا. پاڵەوانێکـی نەتەوەیـی خەڵکـی (پیسـموبیچ) لـە ماسـیگریدا، بـە ئازیزتریـن قولاپـی لە-خەیـزەران-دروسـتکراو و کتێبێکـی شـیعرەکانی (ڕوبێرت فروسـت)ەوە ڕاپێچ دەکرێ. دەڵێ: *هەر بەڕاستی ئەمە ئەوشتانەن، کە پێویستمن.* گرووپێک قارەمانـی (بریـج)ی خەڵکـی مونتێـرەری، بـە زەردەخەنـە و پـارەی هەڵاوسـاوی

نەختینەوە ڕاپێچ دەکرێن. خێزانێکی زەوی بەکرێگرتەی خەڵکی پاجارو، بەو خەیاڵەوە ڕاپێچ دەکرێن، ئاخۆ قەت دەتوانن جارێکی تر دۆڵەکەیان ببیننەوە. ڕەبەنانێکی بەتەمەنی بەهەتاو سووتاو، ڕاپێچ دەکرێن و لە یەک کاتدا خەڵکی هەموو شوێنێک و هیچ کوێش نین، سالانێکی زۆرە هاودەمی وەرزەکانی درەون. باخەوانێکی خەڵکی سانتا ماریا بە قەڵەمێکی گوڵەڕۆدەندۆری باغی خانەخوێیەکەی و گیرفانی پڕ لە تۆوەوە ڕاپێچ دەکرێ. دوکاندارێکی شمەکی بژێویی خەڵکی ئۆسیانسایدە، بە چەکێکی بێبەهای بانقەوە ڕاپێچ دەکرێ، کە شۆفێری لۆرییەک پێی داوە و پێشنیاری بۆ کردووە هەموو شمەکەکانی دوکانەکەی لێ بکڕێ. خاوەن دەرمانخانەیەکی خەڵکی ستۆکتۆن کاتێ ڕاپێچ دەکرێ پارەی دوو ساڵونیوی بیمەی ژیانی داوە. مریشک بەخێوکەرێکی خەڵکی پیتالوما بەو قەناعەتەوە ڕاپێچ دەکرێ، کە هەر هەموومان لە ماوەی سێ مانگدا دەگەڕێینەوە. پیرێژنێکی جوانپۆشی خەڵکی بوربانک، لووتبەرز و جانانە و بە سەرێکی بەرزەوە ڕاپێچ دەکرێ. یەکێک دەڵێ: "خۆی بە کچی ڤیسکونت ئوداس ناگۆڕێتەوە!" یەکێکی تر دەڵێ: "خۆی بە ژنی پیکولون گوتو دەزانێ!" پیاوێک تازەکی لە سان کوینتین ئازاد کراوە و بەو قەرزانەوە ڕاپێچ دەکرێ، کە لە نیوەی دوکاندارانی شاری کردووون. دەڵێ: "ئیدی کاتی ئەوەیە جێی بهێڵین" کچانێکی کۆلێژ - کچە گەورەکانمان - بە قاپووتی ڕەشی گاباردینەوە ڕاپێچ دەکرێن و ئاڵای ئەمەریکایان بە بلوسەکانیانەوە لکاندووە و کلیلی (فای بیتە کاپا)، بە زنجیری ئاڵتوونەوە، بە ملیانەوە دەلەرێتەوە. پیاوانی گەنجی بۆشناخ - کوڕە گەورەکانمان - بە پانتۆڵی تازە ئوتووکراوی خاکییەوە ڕاپێچ دەکرێن و بە هەراهەراوە گۆرانیی بەرخۆدانەکەی (بێرکلی) دەچڕن و وتوویژ لەبارەی پێشبڕکێ گەورەکانی ساڵی ئاییندەوە دەکەن. تازە ژن و مێردێک بە کڵاوی سکیسوارییەوە، قۆڵەقۆڵی یەکدیدا ڕاپێچ دەکرێن

و هیچ وا پێناچێ سەرنجی کەسی تر بدەن. ژن و مێردێکی بەتەمەنی خەڵکی مانتیکو، بە سەرقاڵبوونی هەمان ئەو شەڕ و هەرایەوە ڕاپێچ دەکرێن، کە هەر لە یەکەمین ڕۆژی ئاشنابوونیانەوە لەنێوانیاندا هەڵایساوە. بە یەکتر دەڵێن: *ئەگەر جارێکی تر قسەی وا بکەیت...* پیرەمێردێکی خەڵکی ئالمێدا لە جلکی سوپای ڕزگاریدا، بەدەم ڕاپێچکردنییەوە هاوار دەکا: "خودا خۆشەویستییە! خودا خۆشەویستییە!" پیاوێکی خەڵکی یوبا سیتی لەگەڵ ئیلیانوری کچە نیوەئایرلەندایییەکەیدا ڕاپێچ دەکرێ، کە هەمان ئەو بەیانییە لەلایەن ژنێکەوە درایەوە بەسەریدا، کە دەمێکە دەسبەرداری بووە. دەڵێن گوایە تا هەفتەیەک لەمەوبەر هەر نەشیزانیوە ماوە یان مردووە. زەمین بەکرێگرتەگەلێکی خەڵکی ودلاند بەدەم ڕاپێچکردنییەوە و دوای ئەوەی دوایین بەشی بەروبوومەکەشیان درەو کردووە، ئاوازێکی جاز بە فیکە دەژەنن. بێوەژنێکی خەڵکی کوڤینا ڕاپێچ دەکرێ، دوای ئەوەی وەکالەتێکی بۆ دکتۆرێکی میهرەبان کردۆتەوە، کە پێشنیاری بۆ کردووە خانووەکەی بەکرێ بگرێ. دەڵێ: *پێم وایە هەڵەیەکی گەورەم کردووە.* ژنێکی گەنجی خەڵکی سان جۆیس بە چەپکێک گوڵەوە ڕاپێچ دەکرێ، کە لەلایەن کەسێکی نەناسراوی گەڕەکەوە بۆی هەنێردراوە، کە هەمیشە لە دوورەوە پێی سەرسام بووە. منداڵگەلێکی خەڵکی سالینا بە چەپکەگژوگیاوە ڕاپێچ دەکرێن، کە هەمان ئەو بەیانییە لە باخچەکانیان دەریان کێشاوە. منداڵگەلێکی خەڵکی سان بێنیتو و ناپا، بە لەبەرکردنی چەند دەستێک جلکەوە ڕاپێچ دەکرێن، بۆ ئەوەی هێندەی دەکرێ جلکی زۆر لەگەڵ خۆیاندا ببەن. کچێکی خەڵکی کێڵگەیەکی چوالە لە ئواکداڵ، بە شەرم و ترس و سەرێکی نووساو بە تەنوورەکەی دایکییەوە ڕاپێچ دەکرێ، لەبەر ئەوەی لە هەر هەموو ژیانیدا ئەوەندە خەڵکی زۆری نەبینیوە. سێ کوڕی بچکۆلەی خانەی منداڵانەکەی سان فرانسیسکۆ، بە

چاوەڕوانییەکی زۆرەوە بۆ یەکەمین سەفەریان بە قەتار، ڕاپێچ دەکرێن. کوڕێکی تەمەن هەشت سالانی خەڵکی پلاسیرڤیل، بە بوخچەیەکی بچووکی جلکەوە ڕاپێچ دەکرێ، کە دایەنەکەی، میسز لوهرمان، بۆی پێچابۆوە و هاوکاتیش پێی گوتووە دەبێ لە کۆتاییی هەفتەدا بگەڕێتەوە. گوتوویەتی: *ئێستا بڕۆ بە سەلامەت*. کوڕێکی خەڵکی لیمون کۆڤ کە ڕاپێچ دەکرێ، توند بەپشتی خوشکە گەورەکەیەوە دەنووسێ. خوشکەکەی دەڵێ: *تەنها بەو شێوەیە توانیومە لە ماڵ بیهێنمە دەرەوە*. کچێکی خەڵکی کێرنڤیل بە جانتایەکی بچووکەوە لە مقەبا ڕاپێچ دەکرێ، کە تژییە لە نوقڵ و یاری. کچێکی خەڵکی هابەر بە تەپەپێکردنی تۆپێکی سووری لاستیکەوە ڕاپێچ دەکرێ. سێ خوشکی خەڵکی سەلما – کچانی ماتسوموتو – ڕاپێچ دەکرێن و وەک جاران شەڕ و هەرای گەورەیانە لەسەر باوکیان و لاچاوی یەکێکیشیان شین بووەتەوە. دوو کوڕی جمکی خەڵکی لیڤینگتن کە ڕاپێچ دەکرێن، ئەگەرچی هیچ عەیبێکیشیان نییە، قۆڵبەستی سپییان کردووەتە باڵی ڕاستیان، دایکیان دەڵێ: چەند ڕۆژێکە بەستوویانە. شەش برای کێڵگەیەکی شیلک لە دومینگیوز، بە جزمەی عەسابەوە ڕاپێچ دەکرێن، تا مار پێیانەوە نەدا. یەکێکیان دەڵێ: "ئاخر ئێمە بۆ ناوچە کێوییەکان دەڕۆین." منداڵگەلێک بەو خەیاڵەوە ڕاپێچ دەکرێن، کە بۆ سەیران و چادرهەڵدان دەچن. منداڵگەلێک بەو قەناعەتەوە ڕاپێچ دەکرێن، کە بۆ پیاسە یان بۆ سێرک یاخود بۆ کەنار زەریا دەچن و ڕۆژێکی تەواو مەلە دەکەن. کوڕێک بە کەوشی چەرخدارەوە ڕاپێچ دەکرێ، کە بیری دەکردەوە مادامەکی هێشتا لەسەر جادەی قیرن، ئیدی هیچ بەلایەوە گرینگ نییە بۆ کوێ دەڕۆن. منداڵگەلێک مانگێک بەر لەوەی بڕوانامەی ئامادەیی وەربگرن، ڕاپێچ دەکرێن. یەکێکیان دەڵێ: من لە ستانفورد دەست بە خوێندنی زانکۆ دەکەم. کچێک بەو زانیارییەوە ڕاپێچ دەکرێ، کە لە ئامادەییی

گالیکسیکو بە قوتابی شەرەف دەر دەچێت. منداڵگەلێک ڕاپێچ دەکرێن و هێشتا بیریان لای دەسیماڵ و بەشکەلە. منداڵگەلێکی پۆلی هەشتە ئینگلیزییەکەی میسز کروزیر لە ئیسکوندیدو، بە ئاسوودەخەیاڵی ئەوەوە ڕاپێچ دەکرێن، کە هەفتەی داهاتوو تاقیکردنەوە گەورەکە نادەن. یەکێکیان دەڵێ: سەعیم تیا نەکردووە. کوڕێکی خەڵکی هولیستەر بە پەڕێکی سپی لە گیرفان و کتێبێکەوە لەبارەی باڵندەکانی ئەمەریکای باکوورەوە ڕاپێچ دەکرێ، کە دوایین ڕۆژ هاوپۆلەکانی پێیان داوە. کوڕێکی خەڵکی بایرون بە سەتڵێکی تەنەکەی پڕ لە خۆڵەوە ڕاپێچ دەکرێ. کچێکی خەڵکی ئوپلاند بە بوکەپەڕۆیینەیەکی مرمۆچەوە ڕاپێچ دەکرێ، کە قۆبچەی ڕەش لای چاوییەوەیەتی. کچێکی خەڵکی کاروتهایر بەدەم پەتپەتێنەوە ڕاپێچ دەکرێ و پەتەکەی دادەنێ. کوڕێکی خەڵکی میلپیتا، لێوانلێو لە نیگەرانی بۆ فرانک، بۆ کەڵەشێرە ماڵییەکەی ڕاپێچ دەکرێ، کە لای دراوسێکەیانی داناوە، لە خەڵک دەپرسێ: *بڵێی نەیخۆن؟* کوڕێکی خەڵکی ئۆسیان پارک بەو قروسکە بەسۆیانەی (چیپ)ی سەگیەوە ڕاپێچ دەکرێ، کە هێشتا لە گوێیدا دەزرینگێتەوە. کوڕێکی خەڵکی مۆنتەین ڤیو لە جلکی (بەچکەگورگ)دا ڕاپێچ دەکرێ، کە کەرەستەکانی موبەقی مەیدانی و مەنجەڵی پێیە. کچێکی خەڵکی ئێلک گروڤ بەدەم ڕاوەشاندنی قوڵی پاڵتۆکەی باوکییەوە ڕاپێچ دەکرێ و دەڵێ: *باوکە، با بچینەوە بۆ ماڵەوە، با بچینەوە بۆ ماڵەوە*. کچێکی خەڵکی هانفورد بەدەم بیرکردنەوە لە نامەی (جون)ی هاوڕێیەوە لە ئالاسکا ڕاپێچ دەکرێ. دەڵێ: خۆزگە بیری دەکەوتەوە نامەم بۆ بنووسێ. کوڕێکی خەڵکی براولی کە تازەکی فێری کاتژمێر بووە، بەدەم بەلاچاوسەیرکردنی کاتژمێرەکەی مەچەکییەوە، ڕاپێچ دەکرێ و دەڵێ: "ئەرێ خۆ ئەوە هەر دەگۆڕێ." کوڕێکی خەڵکی پارلێر بە بەتانییەکی شینی فەلانیلەوە ڕاپێچ دەکرێ، کە هێشتا بۆنی ژوورەکەی

پێوە ماوە. کچێکی پرچدرێژی خەڵکی شارێکی بچووک لە تولەیر، بە تەباشیرێکی ئەستووری پەمەییەوە ڕاپێچ دەکرێ، کەڕەتێک ڕادەوەستێ، تا بەو خەڵکەی کە بە ڕیز لەسەر شۆستەکەن بڵێ: *خواحافیز* و پاشان بە جووڵەیەکی خێرا، دەستیان بۆ ڕادەوەشێنێ، پێدەکەنێ و ئینجا بە قەڵەمبازەوە دەکەوێتە ڕێ. دەکەوێتە ڕێ، بەبێ ئەوەی ئاوڕ لەدواوە بداتەوە.

# دیارنەمان

ژاپۆنییەکان لە شارەکەماندا دیار نامێنن. ئێستا خانووەکانیان بۆمببارانکراو و چۆڵن. نامە لە سندوقی پۆستەکانیاندا سەری کردووە. ڕۆژنامە بێ خاوەنەکان بە هەیوان و باخچە وشکەکانیاندا بڵاو بوونەتەوە. ئۆتومبێلی جێهێڵراو لەسەری ڕێگە گشتییەکاندان، کەڵەگیای ئەستوور و دەرپەڕیو لە چیمەنەکانیاندا. لە حەوشەی دواوەی ماڵەکانیاندا، گوڵەلالەی ژاکاو. پشیلەی سەرگەردان بەو ناوەدا دێن و دەڕۆن. جلکی شۆراو بە تەنافەکانەوە. لە یەکێک لە موبەقەکانیاندا – موبەقەکەی ئیمی ساتیۆ – زەنگی تەلەفونێکی ڕەش لێدەدا و هەر لێدەدا.

لە خوارەوە، لە ناوەندی شار لە (مەین ستریت)، هێشتا جامی دوکانی جلکشۆرییەکانیان بە تەختە داخراون. تابلۆی بۆ کرێ بە جامەکانیاندا کراون. با پسووڵە و وەسڵی پارەی نەدراو، بەو ناوەدا دێنێ و دەبا. ئێستا مورتا فلوریست ناوی (فلاوەرس بای کی)یە. یاماتۆ هۆتێل بووەتە پارادیس. ڕێستۆرانی فوجی لە کۆتایی هەفتەدا بە ستافێکی نوێوە دەکرێتەوە. ئیمانشی ترانسفێر داخراوە. بەقاڵیی هارادا داخراوە، تابلۆیەکی بە-دەستخەت-نووسراو کە کەسمان بیری نییە ئاخۆ لەوەوبەر بینیومانە، بە پەنجەرەکەیەوە کراوە و لێی نووسراوە: خوداتان لەگەڵ بێت و بە ئومێدی دیدار. هەڵبەت بەدەست خۆمان نییە لە فیکرەوە نەچین، کە ئاخۆ بڵێی کێ ئەو تابلۆیەی دانابێ؟ یەکێک لەوان؟ یان یەکێک لە ئێمە؟

ئەگەر یەکێک بێ لە ئێمە - بڵێی کێ بێت؟ ئەو پرسیارانە لە خۆمان دەکەین و نێوچەوانمان بە شووشەی پەنجەرەکەوە دەنووسێنین و لە تاریکیدا ورد دەبینەوە، نیوەچاوەڕوان ڕادەوەستین، کە میستەر هارادا خۆی، بە بەرکۆشە ڕەنگبواردووە سەوزەکەیەوە، لە شوێنەکەی خۆی، لەودیو کارمەزەلەکەوە بێتە دەرێ و بەزۆر لاسکێکی گیامارانە، شیلکێکی جوان، پەلکێک نەعنای تەڕوتازەمان بداتێ، بەڵام هیچ شتێک لە ناوەوە نابینین. ڕەفەکان بەتاڵن. ئەرزەکە پاکوتەمیز و جوانسڕدراو. ژاپۆنییەکان بۆ دوور دوور ڕاگوێزراون.

شارەدارەکەمان دڵنیامان دەکاتەوە، هیچ شتێک مایەی نیگەرانی نییە. لە چاپی بەیانیانی (*ستار تریبون*)دا دەڵێ: ژاپۆنییەکان لە جێگەیەکی ئەمیندان. بەڵام دەسەڵاتی ئەوەی نییە ئاشکرای بکا ئەو جێگەیە کوێیە. دەڵێ "ئەگەر بڵێم لەکوێن، ئەوا ئەوان چیدی لە ئەماندا نابن. وا نییە؟" هەندێکمان لە خۆمان دەپرسین: بەڵام ئاخر چ جێگەیەک هەیە لێرە، لەم شارەی خۆمان ئەمینتر؟

هەڵبەت تا بڵێی لێکدانەوە هەن. دەگوترێ ڕەنگە ژاپۆنییەکان بۆ کێڵگەکانی چەوەندەر - مونتانا یان داکوتا - هەنێردرابن، کە لەوێ جووتیاران ئەم هاوین و پاییزە لە هەڵگرتنەوەی بەرەکەیاندا پێویستییەکی زۆریان بە یارمەتییە. یان ڕەنگە لە شارێکی دوور کە کەس نازانێ کەوتۆتە کوێوە، ناسنامەی نوێی چینییان هەڵگرتبێ. یاخود ڕەنگە لە زینداندا بن. برینپێچێکی خانەنشینی هێزی بەرگری زەریایی دەڵێ: "ڕای بێپێچوپەنای منتان دەوێ؟ من پێم وایە لە زەریادان و بە شێوەیەکی زیزکزاکیی بەلای بۆمبە بن ئاوییەکاندا تێدەپەڕن. ئەوانە هەر هەموو بە کەشتی بۆ ژاپۆن هەنێردراونەتەوە، تا کاتێ جەنگ درێژەی هەیە، لەوێ بن." مامۆستایەکی سروشتناسی لە (ئورتینس هسی سکول) دەڵێت: "شەوانە بە بێداری دەمێنێتەوە و هەر زۆر دەترسێ ئەوانە لە

واگۆنی ماڕومالاتکواستنەوەدا ڕاگوێزرابن و ئیتر قەت قەت نەیەنەوە. یان لە پاسێکی بێ پەنجەرەدا دانیشتبن، پاسێک، کە ڕاناوەستێ، نە سبەینێ، نە هەفتەی داهاتوو، نە قەتاوقەت، یاخود بە ڕیز بەسەر پردێکی درێژی دارینیدا دەڕۆن و کاتێ دەگەنە بەری ئەوبەری پردەکە، ئیتر دیار نامێنن." ئەو ژنە مامۆستایە دەڵێ: "من بیر لەو شتانە دەکەمەوە. پاشان بیرم دەکەوێتەوە: خۆ ئەوان دیار نەماون."

هێشتا دەتوانرێ ئەو بەیاننامە فەرمییە ببینرێ، کە لە خوارەوە، لە پێچی جادەکەدا، لە ناوەندی شار بە عامودی تەلەفۆنەکانەوە داکوتراوە، بەڵام ئێستا دڕاوە و شڕوپڕ بووە و دوای لێزمەبارانە بەهارییەکەی هەفتەی ڕابردوو، تەنها ئەو پیتە گەورانەی سەری سەرەوەی پێوە ماوە – ئاگاداری بۆ هەموو ئەو کەسانەی بنەچەی ژاپۆنییان هەیە – کە هێشتا دەتوانرێ بخوێندرێنەوە. بەڵام ڕێک ناوەڕۆکی ئەو ئاگادارینامەیە چییە، کەسمان بەتەواوی بیرمان ناکەوێتەوە. پیاوێک بەحاڵ خاڵێکی لەو ئاگادارینامەیە بیرە، کە دەڵێ کەس ئاژەڵیماڵەوە لەگەڵ خۆیدا نەبات، هەروەها جێگەیەکیشی بۆ بەڕێکەوتن تێدا دیاری کراوە. ئەو پیاوە دەڵێ: وا بزانم ئەو جێگەیە KFUM بوو لە وێست فیفس ستریت. بەڵام دڵنیا نییە. ژنە سێرڤێرتەرێک لە ڕێستۆرانی بلو ڕیبون دەڵێت: هەمان ئەو بەیانییەی ئاگادارینامەکە داکوتراوە، هەوڵی داوە بیخوێنێتەوە، بەڵام نەیتوانیوە بەباشی نزیک بێتەوە. دەڵێ، هەر هەموو عامودی تەلەفونەکان بە دەستە و گرووپی بچووک بچووکی ژاپۆنیکەلی نیگەران دەورە درابوون. ئەوەی واقی وڕماندووە، ئەوە بووە کە هەر هەموویان چەندە بێدەنگ و ئارام بوون. ئەو ژنە سێرڤێرتەرە دەڵێ، هەندێک لە ژاپۆنییەکان لەوێدا ڕاوەستاون و بەکاوەخۆ سەریان لەقاندووە. هەندێکی تریان یادداشتیان نووسیوە. کەسیان یەک تاقە وشەیان لە دەم نەهاتووەتە دەرەوە. زوربەمان پێ لەوە دەنێین، کە گەرچی هەموو ڕۆژێک لە ماڵەوە بەرەو

شار بەلای ئاگادارینامەکەدا تێپەڕیوین، کەچی قەت نەهاتووە بەسەرماندا ڕاوەستین و شتێکی لێ بخوێنینەوە. گوتوومانە: پەیوەندیی بە ئێمەوە نییە. یان گوتوومانە: هەمیشە درەنگمانە. یاخود نەمانتوانیوە هیچی لێ بخوێنینەوە، لەبەر ئەوەی بە دەسخەتێکی زۆر ورد نووسراوە.

ئەوە منداڵەکانمانن، کە شوێنبزربوونی ژاپۆنییەکان زۆر کاریان تێ دەکا. ئاخر دوای ڕاگوێزرانی ژاپۆنییەکان، منداڵەکانمان لاساریمان زۆر لەگەڵ دەکەن. مل بۆ سەعیکردن نادەن. ساوگەرتی دەبن. شەڕ دەفرۆشن. ئەوانەی لەوەوبەر ئازا بوون، ئێستا ئیتر کە دەچنە نێو جێگە، دەترسن گڵۆپ بکوژێندرێتەوە. یەکێک لە منداڵەکان دەڵێ: "هەر کە چاو لێک دەنێم، دەیانبینم." منداڵێکی تریان پرسیار دەکا بۆ کوێ بچێت، تا بیاندۆزێتەوە؟ ئاخۆ قوتابخانەیەک هەیە ئەوانی لێ بن؟ ئەدی چی لە بلوسەکەی (لاستەر ناکانو) بکا؟ وەڵامی دەدەینەوە: هەڵی بگرە یان فڕێی بدە." دوور لە لینکۆلن ئیلیمێنتری؛ یەک پۆلی تەواوی دووەکان دڵنیان کە هاوپۆلە ژاپۆنییەکانیان لە دارستاندا شوێنبزر بوون. کچێکیان دەڵێ: "گزگل و گەلا دەخۆن و یەکێکیشیان کە قەمسەڵەکەی بیر چووە، ئێستا سەرمایەتی، هەڵدەلەرزێ و دەگری. یان ڕەنگە مردبێ." کوڕێک کە لای ئەو کچەوە دادەنیشێ، دەڵێت: "ئا، مردووە." ئەو ژنە مامۆستایە دەڵێ، زەحمەتترین چرکەسات ئەو ساتەیە، کە ناو دەخوێنێتەوە. ئاماژە بۆ سێ کورسییە چۆڵەکان دەکات: ئۆسکار تاژیما، ئالیس ئۆکامۆتۆ و قوتابییە خۆشەویستەکەی خۆی، دلۆریس نیوا. هەر زۆر شەرمن. هەموو بەیانییەک ناوەکانیان دەخوێنێتەوە، دیارە قەت وەڵام نادەنەوە. "منیش هەمیشە وەک نەهاتوو ناویان دەنووسم. ئەدی چ بکەم؟" پاسەوانی هاتوچۆی قوتابخانە دەڵێ: "شتێکی ناخۆشە. منداڵگەلێکی جوان بوون. بیریان دەکەم."

بەڵام هەندێک هاوولاتیمان هەن، هەناسەی ئاسوودەیی هەڵدەکێشن کاتێ دەبینن ژاپۆنییەکان ڕۆیشتوون. ئاخر ئێمە بەسەرهاتمان لە ڕۆژنامەکاندا خوێندوونەتەوە. وتیوتی و پڕوپاگەندەمان بیستوون. زانیومانە چەکی نهێنی لە ژێرزەمینی جووتیارە ژاپۆنییەکاندا لە شارانێک دۆزراونەتەوە، کە زۆر لێمانەوە دوور نین، تەنانەت ئەگەر دڵنیاش بین لەوەی کە ئەگەر هەمووشیان نەبێ، ئەوا زوربەی ژاپۆنییەکانی شارەکەی خۆمان، هاوولاتیی باش و جێگەمتمانە بوون، بەڵام ناتوانین دڵنیا بین لە لایەنگیریتیی بێچەندوچوونیان لێمان. دایکێکی خاوەن پێنج منداڵ دەڵێ: "ئەوانە شتیان زۆر زۆر بوو، کە ئێمە نەماندەزانین. ئەوە ناڕەحەتی دەکردم. هەمیشە هەستم دەکرد شتێکمان لێ دەشارنەوە." کاتێ پرسیاریان لە کرێکارێکی کارگەی سەهۆڵەکە کردووە، ئاخۆ هەستی بە دڵنیایی کردووە کە ماڵەکەی بەرامبەر ماڵی خانەوادەی میاموتو، لەوبەری جادەکەوە بووە، ئەو کرێکارە لە وەڵامدا گوتوویەتی: "هەر بەڕاستی نەء." گوتوویەتی" خۆی و ژنەکەی هەمیشە زۆر بەپارێز بوون لە پەیوەندییان بە ژاپۆنییەکانەوە. لەبەر ئەوەی هەر زۆر سووک و هاسان هەستمان دەکرد لێیان دڵنیا نین. بڕوام وایە ئەوان خەڵکی باش و خراپیان تێدا بووە، بەڵام هەمیشە لێم تێکەڵ دەبوون." هەڵبەت بۆ زوربەمان زەحمەتە باوەڕ بکەین هاوسێکانی جارانمان هەڕەشە بووبن بۆ سەر شارەکەمان. ژنێک کە خانووی بە خانەوادەی ناکامورا دابووە کرێ، دەڵێ ئەوان باشترین کرێچی بوون، کە لە ژیانیدا هەیبووبن: "میهرەبان؛ بەنەزاکەت و پاکوتەمیز؛ تا ڕادەیەک دەتتوانی لەسەر ئەرزەکەیان نان بخۆیت." مێردەکەی دەڵێ: "هەروەها ئەمەریکاییانەش دەژیان. هیچ شتێکی ژاپۆنی لە ماڵیاندا نەبوو. تەنانەت گوڵدانێکیش."

هەواڵمان لەبارەی لەمپاگەلێکەوە پێ دەگا، کە هێشتا لە هەندێک ماڵە ژاپۆنییەکاندا دەسووتێن و هەواڵ لەبارەی ئاژەڵگەلێکی نیگەرانەوە:

کەنارییەکی لەپەلوپۆکەوتوو، کە بەئاستەم لە پەنجەرەی ڕووەو جادەی مالی (فوجیمۆتو)وە دیارە. ماسیی نیوەمردووی کافور لە حەوزێکی دووردا، لای یاماگوتچی. سەگ لە هەموو شوێنێک. جامەئاو و پارچەنان و بەرماوەی خواردنەکانمانیان بۆ دادەنێین. قەسابەکە نەرمەیەکی تازەیان بۆ دەنێرێ. سەگەکەی کویاما بەئەدەبەوە بۆنی دەکا و پاشان ئاوڕ بۆ دوور دەداتەوە. سەگەکەی (ئویدا) بەلاماندا فرتە دەکا و بەر لەوەی پێشی بگرین، دەگاتە دەرەوەی پەرژینەکە. سەگەکەی ناکانیشی - کە تێریەرێکی سکۆتییە و لەگەڵ فالای سەگە بچووکە ڕەشەکەی سەرۆکدا دەڵێی سێوێکن و کراون بە دوو کەرتەوە - کەڵبەکانی وەدیار دەخا و لێناگەڕێ نزیکی ببینەوە. بەڵام سەگەکانی تر بە ڕاکردن بۆ لامان دێن تا سلاومان لێ بکەن، وەک ئەوەی هەمیشە ئاشنامان بن، پاشان دوامان دەکەون بۆ مالەوە و لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا خاوەنی نوێیان بۆ دەدۆزینەوە. خێزانێک دەڵێن هەر زۆر حەز دەکەن سەگێکی ژاپۆنی بگرنە خۆیان. خێزانێکی تر پرسیاری سەگی توخمی کۆلی دەکەن. هاوسەری سەربازێکی گەنج، کە تازەکی بۆ سەربازی بانگ کراوە، دوکی، سەگە ڕەشە مەیلەوقاوەییبە بیگلەکەی مارویامای بۆ مالەوە هێناوەتەوە، کە ژووراوژوور دوای دەکەوێ و چاوی لێ خافڵ ناکا. دەڵێ: ئێستا ئەو پارێزگاریم دەکا. باش بە یەکەوەهەڵدەکەین." بەڵام جاروبار گوێی لێیەتی نیوەشەوان لە خەوندا گنەگن دەکا و ئەمیش لە فیکرەوە دەچێ، کە ئاخۆ بلێی خەون بەوانەوە نەبینێت.

دەبیستین هێشتا بەشێکیان لە ناوماندا دەژین. هیدیۆ کوداما، قومارچیی گەورە لە زیندانی ناحیەدایە. ژنێک کە مانگی خۆیەتی لە خەستەخانەیەکی گشتیدا کەوتووە و دە ڕۆژ بەسەر وادەی منداڵبوونەکەیدا تێپەڕیوە. *ساواکە هەر زۆر سووک و هاسان حەز ناکات بێتە دەرێ.* ژنێکی سیونۆ سال لە خەستەخانەیەکی دەروونی داخل کراوە و بەدرێژاییی ڕۆژ بە کراسی

خەو و نەعلەوە بە ڕاڕەوەکاندا دەگەڕێ و لەبەر خۆیەوە بە ژاپۆنیی، کە کەس هیچی لێ تێناگات، قسان دەکات. تاقە وشەیەک کە دەیزانێت "ئاو" و "بڕۆ ماڵەوە"یە. دوکتۆرەکەی دەڵێ، ئەو ژنە بەر لە بیست ساڵ دوو منداڵی بچووکی لە ئاگرێکدا سووتاون، لە کاتێکدا خۆی لەگەڵ پیاوێکی تردا لە کێڵگە بووە. ڕۆژی دواتر مێردەکەی خۆی کوشتووە و پیاوە دۆستەکەشی دەسبەرداری بووە. ئیدی دوای ئەوە، قەت نەبووەتەوە بەو ژنەی جاران. لە قەراغی باشووری شار، لە خەستەخانەی سیلی کلیەرڤیو، کوڕێکی دوازدە ساڵان لەسەر قەرەوێڵەیەکی لای پەنجەرەکەوە ڕاکشاوە و وردەوردە بە میکرۆبی سیل لە بڕبڕەی پشتدا دەمرێت. ڕۆژێک بەر لەوەی شار جێ بهێڵن، دایک و باوکی بۆ دوایەمین جار بۆ سەردانی دەچن، ئێستا ئەو بەتەواوی تەنیایە.

هەر ڕۆژێک کە تێدەپەڕێ، ئاگادارینامەی سەر عامودی تەلەفونەکان شڕوپڕتر دەبێ. بەیانییەک ئاسەواری چ ئاگادارینامەیەکیان پێوە نامێنێ. بۆ ساتێک هەست دەکرێ شار بە شێوەیەکی سەیر ڕووتوقووتە، وا پێدەچێ ژاپۆنییەکان هەر لێرەش نەبووبن.

گوڵەلاولاوی کێوی لە باخچەکانیاندا دەڕوێتەوە. زەڵی لاولاو لە حەوشەیەکەوە بۆ حەوشەیەکی تر بڵاو دەبێتەوە. لەبن پەرژینەکاندا پیمەڕە بەجێ ماوە و دەڕزێ. لەخوار پەنجەرەکەی (ئوتیرو)ەوە ڕووە و جادە، تەلانێکی یاسوەنەوش گوڵی مۆری تۆخی کردووە و بۆ سبەینێ دیار نامێنێ. دارلیمۆیەک لە (ساوادا) هەڵکێشراوە، کێلوونی دەرگا لەناوەوە و دەرەوەی ماڵەکاندا شکێندراون. ئوتومبێل دزراون. هەورەبان تالان کراون. لوولەی دووکەڵکێش شکێندراون. تاریکەشەوان کارتۆن و جانتا لە ژێرزەمینەکان دەدزرێن و لە ترومبێلەکان بار دەکرێن. کێلونی دەرگە و گڵۆپ دیار نامێنن. لە دوکانی ڕەهن و دەستی دووەکاندا، لە دەرەوەی (تایرد ئاڤینیو)، ئامێری سەیروسەمەرە، هی خۆرهەلاتی دوور،

تـەواو بـۆ ماوەیەکـی کـورت، بـەر لـەوەی شـوێنی خۆیـان لـە هەندێـک لـە ماڵەکانمانـدا بدۆزنـەوە، دەر دەکـەون. فانۆسـێک لـە باخێکـی وەقفکراودا لـە (مەیپڵریچ ڕۆد)؛ لەنێو گوڵەڕۆدەندرۆنەکانـدا دەسـووتێ. لوولەیـەک کاغـەزی بۆیەکـراوی دیـواری، جێگـەی وێنـەی مەلەوانێکـی ڕووتـی لـە ژووری میوانێـک لـە (ئیلـم) گرتۆتـەوە. گـەڕەک دوای گـەڕەک ئۆرتـەی خۆرهەڵاتی لـە بەرپێکانمانـدا ڕادەخرێن. لـە خۆرئـاوای شـار، کتوپڕ بەکارهێنانـی تەوقـە و قردێلـەی دار لەنێـو دایکانـی گەنجـدا کـە ڕۆژانـە سـەردانی پارکەکـە دەکـەن، دەبێتـە شتێکی بـاو. یەکێک لـەو دایکانـە لە کاتێکدا سـاواکەی لەبەر سـێبەرەکەدا لەسـەر سـەکۆیەک ڕادەژەنـێ، دەڵـێ: "هـەوڵ دەدەم بیر لـەوە نەکەمـەوە ئـەو تەوقـە و قردێلانـە لەکوێـوە هاتـوون. هەندێ جـار باشـترین شـت ئەوەیـە کـە نەزانرێـت."

بـۆ مـاوەی چەنـد هەفتەیـەک هەندێـک کـەس لـە ئێمـە بەردەوامـن لـە ئومێدخواسـتن بـە گەڕانـەوەی ژاپۆنییـەکان، لەبـەر ئـەوەی کـەس نەیگوتـووە ئـەوان بـۆ هەتاهەتـا دوور کەوتوونەتـەوە. لـە فولکـەی پاسـەکاندا چاویـان بـۆ دەگێڕیـن. لـە دوکانـی گوڵفرۆشـییەکان. کاتـێ بـەلای ڕادیۆچاککەرەوەکـەدا لـە (سـێکوند ئاڤینیـو)، کـە جـاران بـە (ناگاماتسـو فیـش) ناسـرابوو، تێدەپەڕیـن، چاویـان بـۆ دەگێڕیـن. جـار دوای جـار لـە پەنجـەرەوە تەماشـای باخەکەمـان دەکەیـن، بـەو ئومێـدەی ئـێ ئەمـە خوایـە بەڵکـوو باخەوانەکەمـان کتوپـڕ بەدزییـەوە گەڕابێتـەوە. دەڵێیـن: *هەمیشـە تروسـکەیەکی ئومێـد هەیـە، کـە (یوشـی) لـە دەرەوە بـێ و خەریکـی گەڵاڕنیـن بێـت.* بیـر لـەوە دەکەینـەوە، ئاخـۆ بڵێـی بـە جۆرێـک لـە جۆرەکان ئـەوە خەتـای ئێمـەی تێدا بووبێـت. دەکـرا داخوازینامەیەکمـان بدایەتـە شـارەدار، بدایەتـە حکومـەت، بدایەتـە سـەرۆک خـۆی. تیایدا بماننووسیایە: تکایە لێگـەڕێ بمێننـەوە. یاخـود دەبوو هـەر زۆر سـووک و هاسـان لـە دەرگـەی ژاپۆنییەکانمـان دابـا و یارمەتیـی خۆمـان پێشـکەش کردبـان. بـە خۆمـان دەڵێیـن: ئایـی ئەگـەر بمانزانیبـا. بـەڵام

دواییـن جـار یەکێکمـان، میسـتەر مـوری لای مێـزی میوەفرۆشـییەکەیەوە بینیـوە، کـە هـەر وەک جاران میهرەبان بـووە. دەڵـێ: "ئـەو هیچـی لەبـارەی ڕاپێچکردنەکەیـەوە پـێ نەگوتـم. سـێ ڕۆژ دواتـر دیار نەما." ژنە فرۆشیارێک لـە (ئاسـۆیتەد مارکێت) دەڵـێ: ڕۆژێـک بەرلـەوەی ژاپۆنییەکان دیـار نەمێنن، شمەکی خواردەمەنییـان بۆ خۆیـان کڕیـوە،" وەک ئـەوەی دونیـا ئاخیـر بێت" ئـەو باسـی ئـەوەی دەکرد، کـە ژنێـک زیـاد لـە بیسـت قووتـوو ڤاینـەر کۆرڤـی کڕیوە."قـەت بەبیرمـدا نەهـات لێـی بپرسـم بۆچـی. تەنهـا دەمـەوێ بزانـم ئاخـۆ وەزعـی ئـەو ژنـە باشـە."

لێرەولـەوێ، لـە سـندوقی پۆسـتدا لـە سـەرتاسـەری شـار، یەکەمیـن نامـەی ژاپۆنییەکانمـان پـێ دەگـەن. کوڕێـک لـە سـیکاموری، پۆسـتکارتێکی لـە (ئیـد ئیکیـدا)وە، کـە ڕۆژێـک لـە ڕۆژان لـە (ویـدڕاو ویلسـن جونیـور هـای)، خێراتریـن یاریزانـی ڕاکـردن بـووە، پـێ دەگات. لـە پۆسـتکارتەکەدا نووسـیویەتی: *بەڵـێ، ئێسـتا ئێمـە لـە سـەنتەری پێشـوازین. قـەت ئەوەنـدە ژاپۆنیـم لـە هەمـوو ژیانمـدا نەبینیـوە. بەشـێکمان هیـچ ناکەیـن، جگـە لـە خەوتـن بەدرێژاییـی پاشـنیوەڕۆ.* کچێکـی خەڵکـی مولبێـری سـتریت، (یـان) ی کۆنـە هاوپۆلـی تەلەفونـی بـۆ کـردووە و گوتوویەتـی: *پێموایـە ماوەیەکـی تریش لێرە دەمانهێڵنـەوە و پاشـان بـۆ بـەری ئەوبـەری چیـا دەمانگوێزنـەوە. هیوادارم بـەم زووانـە گوێـم لـە دەنگـت بێت.* ژنەکـەی شـارەدار پۆسـتکارتێکی لـە (یـوکا)ی کارەکـەرە بەوەفاکەیـەوە پـێ دەگا، کـە ڕۆژێـک دوای ئـەوەی لـە کەشـتییەکە دابەزیـوە، چووبـووە بـەردەم ماڵەکـەی. لـە پۆسـتکارتەکەیدا نووسـیویەتی: *بیرت نەچـێ هەمـوو سـەری مانگێک بەتانییەکان بدەیتـە بـەر هەتـاو.* ژنەکـەی قەشـەمامۆسـتا لـە کڵێسـای میتۆدیسـت نامەیـەک دەکاتـەوە و دەبینـێ بـۆ مێردەکـەی هاتـووە و ئاوهـا دەسـت پـێ دەکا: *خۆشەویستەکەم، من باشـم.* قەشـەژن کـە ئـەوە دەخوێنێتـەوە، کتوپڕ هـەر هەمـوو دونیـای لـە بەرچـاو تاریـک دەبـێ. دەڵـێ: *ئـەدی بڵێـی ئـەم (هاتسـوکو)وە کـێ بـێ؟* سـێ

گەڕەک دوورتر، لە خانوویەکی زەردا لە والنوت، کوڕێکی نۆ ساڵان نامەیەکی (لاستەر)ی هاوڕێی گیانیبەگیانی خۆی دەخوێنێتەوە: *ئا، سەیرکە، بزانە بلوسەکەمم لە ژوورەکەتدا بیر نەچووە؟* ئەوە دەخوێنێتەوە و ئیدی سێ شەوی لەسەریەک خەو ناچێتە چاوی.

خەڵک کەوتوونەتە ئەوەی داوای وەڵام بکەن. ئایا ژاپۆنییەکان بە خواستی خۆیان ڕۆیشتوون بۆ سەنتەری پێشوازی یاخود بەزۆر؟ دوایین وێستگەیان کوێ بووە؟ بۆچی پێشتر ئێمە لە سەفەرەکەیان ئاگادار نەکراوینەتەوە؟ کێ - ئەگەر کەسێک هەبێ - لەبری ئەوان دەدوێ؟ ئایا ئەوان بێگوناهن؟ ئایا گوناهبارن؟ ئایا هەر بەڕاستی ڕاگوێزراون؟ ئاخر سەیر نییە کە هەر بەڕاستی هیچکەس لەوانەی دەیانناسین، ئەوانیان نەبینیبێ کاتێ ڕاپێچ کراون؟ ئەندامێکی سوپای کۆماندۆی بەرەی ناوخۆ دەڵێ: "لەگەڵ ئەوەشدا پێم وایە لانی کەم یەکێک لە ئێمە دەبوو شتێکی بینیبا یان بیستبا. ئاخر فیشەکێکی ئاگادارکردنەوە، هەناسەهەڵکێشانێک، ژمارەیەک خەڵک کە بە شەو دیار نامێنن." پیاوێک لە بەرگریی ناوخۆی میللی دەڵێ، ڕەنگبێ هێشتا ژاپۆنییەکان لەلای خۆمان بن، لەبەر سێبەرەکانەوە سەرنجمان بدەن، لە ڕووخسارمان ورد ببنەوە، تا بزانن ئاخۆ نیشانەی غەم یان ئازاری ویژدانیان پێوەیە. یاخود ڕەنگبێ لەژێر جادەی شارەکانماندا خۆیان حەشار دابێ و پلان بۆ تێکشکانی کۆتاییمان داڕێژن. ئەو پیاوە ئاماژە بەوە دەدا، بۆی هەیە نامەکانیان تەزویر کرابێ. دیارنەمانەکەیان شتێکی دروستکراو بێ. ئەو پیاوە ئاگادارمان دەکاتەوە، کە ئێمە هێشتا ڕۆژی حیسابمان لەپێشە.

شارەدار تکامان لێ دەکا سەبرمان هەبێت. دەڵێ: "کاتێ بتوانین، ئەوا ئەو وەڵامانەتان دەدەینەوە، کە دەتوانین بتاندەینەوە". پێمان دەڵێن: خیانەت لە هەندێ لاوە ڕووی داوە، کات کەم و مەسەلەکە پێویستی بە کاری دەستوبرد بووە، ژاپۆنییەکان بە خواستی خۆیان و بەبێ ڕقوکینە

و لەسەر داوای سەرۆک بەڕێ کراون. ئەوان هێشتا خولّقیان هەر زۆر باشە. ئیشتیهایان باشە. ڕاگواستنیان بەپێی پلان و نەخشە بەردەوام دەبێ. شارەدار وەبیرمان دێنێتەوە کاتەکە نائاساییە. ئێمە ئێستا لە بەرەی پێشەوەی جەنگداین و پێویستە هەرشتێک کە دەیکەین، لەپێناو بەرگریکردن بێت لە نیشتمان. شارەدار دەڵێ: "شتگەلێک ڕوو دەدەن، نابێ خەڵک ببینن. شتی وا دەبێت. ژیانیش هەر بەردەوامە."

یەکەمین ئاماژەکانی هاوین. گەلا بە پەلکی دارماگنۆلیاوە دەژاکێ. پیادەڕۆکان بە هەتاو گەرم دەبن. کاتێ زەنگی قوتابخانە بۆ چوونە دەرەوە لێدەدرێ، هەوا پڕ لە هاوارهاوار دەبێ و دەرگەی قوتابخانەکان جارێکی تر دادەخرێنەوە. دڵی دایکان سەخڵەت دەبێ. گلەوگازندە دەکەن: دیسان بەزمەکەیە. هەندێکیان بەدوای دایەنی نوێدا دەگەڕێن، تا ئاگایان لە منداڵە بچووکەکانیان بێت. هەندێکی تر بانگەواز بۆ ئاشپەزی نوێ بڵاو دەکەنەوە. زۆر کەس باخەوان و کارەکەری نوێ دەهێنن: کچانی گەنجی گورجوگۆڵ لە فیلیپینەوە، هیندۆییی باریکەلەی ڕیشن، مەکسیکی کورتەبنەی میهرەبان و هەمیشەمەست لە ئۆکساکاوە– دەڵێن *Buenos dias* و *Si, como no?* – و ئامادەن چیمەن بە نرخێکی هەرزان ببڕن. زوربەمان دان بە جەرگی خۆماندا دەنێین و جلک بۆ شتن دەدەینە چینییەکان. تەنانەت ئەگەر جلکی خەوەکانمان هەمیشە باش ئووتووکراو بۆ نەگەڕێتەوە و هەندێ جار پەرژینەکانمان بەباشی بۆ چاک نەکرابن، بەڵام ئەوە ناڕەحەتمان ناکا، چونکە خەیاڵمان لە شوێنی ترە: خەیاڵمان لای گەڕان بەدوای کوڕێکی ونبوودایە بە ناوی هێنری، کە دوایین جار بینراوە لەسەر کۆتەرەدارێک لە قەراغی دارستانەکەدا گەمەی هاوسەنگیری کردووە. (منداڵەکانمان بۆمان دەگێڕنەوە: ئەو ڕۆیشتووە تا لای ژاپۆنییەکان بێت)، خەیاڵمان لای بەدیلگیرانی حەوت سەربازی شارەکەمانە، لەشەڕێکدا لە کۆریگیدۆر، خەیاڵمان لای سیمینارێکە لە فراقینی سالآنەدا لە (پیلگریم مۆسێرس

کلوب) لە لایەن د. ڕاول ئاچیندۆرف، لەلایەن ئەو نازییە پەنابەرە تازە هاتووەوە، بە ناونیشانی هیتلەر: "ناپلیۆنی ئەم سەردەمەمانە؟" کە چەند کەسێک ئامادەی دەبن.

لە کاتێکدا کە شەڕ بەردەوامە، خێزانەکان بە پلەیەکی کەمتر ماڵەکانیان جێ دێڵن. بەنزین دابەش دەکرێ. ئەلەمنیۆم کۆ دەکرێتەوە. باخەکان لە شوێنی پرگژوگیای چۆلوهۆلدا دەڕوێندرێن و خۆرشتی لۆبیای سەوز، موبەق لەدوای موبەق، بەخێرایی بۆنوبەرامەی خۆی لەدەست دەدا. دایکان کەمەربەندەکانیان لە خۆ دەکەنەوە، تا پیشکەشی کۆمەکی لاستیکی بکەن و ئیدی بۆ یەکەم جار دوای ساڵانێکی زۆر، هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەمژن. هاوار دەکەن: "دەبێ گیانفیدایی بنوێنرێت." باوکانی تووڕە جۆلانەی لەتایەدروستکراوی منداڵەکانیان بە درەختەکانەوە لێدەکەنەوە. کۆمیتەی چینی بۆ کۆکردنەوەی کۆمەک دەگاتە ئامانجی خۆی، بە کۆکردنەوەی دە هەزار دۆلار، شارەدار خۆی لەبارەی ئەو هەواڵە خۆشەوە بروسکە بۆ مادام چاینگ کای-شیک دەنێرێ. مامۆستاقەشە شەوێکی تریش لە دەرەوە لەسەر قەنەفەکە بەسەر دەبا. زۆر لە منداڵەکانمان هەوڵ دەدەن نامە بۆ هاوڕێ ژاپۆنییەکانیان بنووسن، بەڵام هیچیان بۆ نایەت. منداڵەکانی تر دڵیان نایەت هەواڵە ناخۆشەکانیان بۆ بنووسن: *کوڕێکی تر لەسەر کورسییەکەی تۆ لە پۆلەکەی میس هۆلدین دادەنیشێت. بلوسەکەتم نەدۆزیوەتەوە. دوێنێ ترومبێلێک سەگەکەتی کرد بە ژێرەوە.* نامەبەرەکە زەندەقی کچێک لە (نۆرس فریمونت) دەبا و پێی دەڵێ: *تەنها خاینێک دەتوانێت نامە لەگەڵ ژاپۆنییەکاندا ئاڵوگۆڕ بکات.*

خەڵکی تازە دەکەونە ئەوەی بۆ خانووەکانی ژاپۆنییەکان بگوێزنەوە. وەرزێرانی خەڵکی ئۆکلاهوما، ئارکانساس، ئۆکیەس و ئارکیەس، کە ڕووەو خۆرئاوا بۆ کاری جەنگی ملیان ناوە. جووتیارانی کرێنشینی دەرکراوی خەڵکی ئۆزارکی ولاتانی سەرەوە، زنجییانی هەژار بە خۆیان

و بوخچەکانیان، کە کەلوپەلەکانیانی تێدان، ڕاستەوخۆ لە باشوورەوە دێن. وێڵگەرد و خانووزەوتکەر؛ لادێیی، جۆری ئێمە نا. هەندێکیان ناتوانن تەنانەت بە حینجەکردنیشەوە بخوێننەوە. دە-پازدە سەعات لە ڕۆژێکدا لە کارگەکانی تەقەمەنیدا ئیش دەکەن، سێ-چوار خێزانیان لە خانوویەکدا دەژین. جلکەکانیان لە دەرەوە، لەتەشتدا و لە دیوی پێشەوەی باخچەکاندا دەشۆن. لێدەگەڕێن ژن و منداڵەکانیان چۆنیان دەوێ ڕاکەڕاک بکەن. لە ڕۆژانی پشووشدا، کاتێ لە دەرەوە لە بەرهەیوانەکانیان دادەنیشن و جگەرە دەکێشن و تا درەنگانێکی شەو دەخۆنەوە، ئێمە بیری هاوڕێ دێرینەکانمان، بیری ژاپۆنییە بێدەنگەکانمان دەکەین.

لە کۆتای هاویندا یەکەمین پروپاگەندەکان دوور دوور لەبارەی قەتارگەلێکەوە دەگاتە گوێمان. خەڵک دەڵێن ئەو قەتارانە فرە کۆنن. پاشماوەی سەردەمێکی دوورن. واگۆنی تۆزوخۆڵاوی بە قەتاری هەڵمیی خەڵوز و لەمپای کۆنی گازەوە. ساپیتەکانیان پۆشراو بە ڕیقنەی باڵندە. شووشەی پەنجەرەکانیان تاریک بە پەردە. بە شارێکدا تێدەپەڕن و دەگەنە شارێکی تر، بەڵام قەت لا نادەن و ڕاناوەستن. قەت تووت تووت ناکەن. تەنها دوای خۆرئاوابوون دەجووڵێن. ئەوانەی ئەو قەتارانەیان بینیون، دەڵێن: *ئەوانە قەتاری تارمایین.* هەندێک کەس دەڵێن، بینیویانن بە ڕێگە باریکەکانی چیای (سیرا نیڤا)دا تێپەڕیون: ئالتەمونت، سیسکیو، شاستا، تیچاپی. هەندێک کەس دەڵێن، ئەو قەتارانە بۆ چیای گابەردینی لێوارەکانی خۆرئاوا بەڕێوەن. کارمەندێکی کاتراگر لە سێنتەری قەتاری (تروکێ) دەڵێ، پەردەی جامێکی قەتارەکەی بینیوە هەڵدراوەتەوە و بۆ چاوتروکانێک ڕووخساری ژنێکی هاتووەتە بەرچاو. دەڵێ: ئەو ژنە ژاپۆنی بووە. بەڵام هەموو ئەوە هێند خێرا تێپەڕیوە، کە مەحاڵە بزانرێت ئاخۆ وایە یان نا. قەتارەکە چ خشتەیەکی کاتی نەبووە؛ ژنەکە شەکەت دیار بووە؛ قژێکی ڕەشی کورت و دەموچاوێکی خڕی هەبووە. ئەو

کاتراکره وا دەڵێ و ئێمەش لە فیکرەوە دەچین، ئاخۆ بڵێی ئەو ژنە لە ژاپۆنییەکانی ئێمە بووبێت؟ بڵێی ژنەکەی ئێتروّسی خاوەن جلکشۆرییەکە بووبێت، یاخود ئەو پیرێژنە بووبێت، کە هەموو رۆژانی پشوویەک لە سووچی نێوان ئێدوارد و ستەیتدا گوڵی دەفرۆشت و ئێمە ناومان نابوو *خانمی گوڵەکە*؟ یاخود کەسێک بێ، کە ئێمە کەرەتکەلێکی بێشومار لە شەقامدا بەلایدا رەت بووین، بەبێ ئەوەی هەستمان بە بوونی کردبێت.

لە پاییزدا هیچ ئاهەنگێکی بودایی بۆ درەو لە (ماین ستریت) رێک ناخرێت. هیچ ئاهەنگێکی گوڵەداودی ساز نادرێت. هیچ رێڕۆیشتنێک بە چرای کاغەزیی هەڵتۆقیوەوە لە زەردەپەردا ناکرێت. هیچ منداڵێک بە جلکی لۆکەی کیمۆنۆی قۆڵدرێژەوە تا درەنگانێکی شەو بە دەنگی توندی دەهۆڵ سەما ناکا. ئەوە تەنها لەبەر ئەوەی ژاپۆنییەکان دوورن. خانەنشینێکی پیر کە زیاتر لە دە ساڵ لە خانووەکەی تەنیشت ماڵی خانەوادەی ئۆگاتادا دەژی، دەڵێ: "من نیگەرانیانم. دوعایان بۆ دەکەم، پاشان هەر سووک و هاسان دەبێ درێژە بە ژیان بدەین." ئەو پیرەمێردە هەرکاتێک هەست بە تەنیایی بکا، دەچێتە دەرەوە و لە پارکەکە لەسەر سەکۆیەک دادەنیشێ. دەڵێ: "تا ئەو کاتەی هەست دەکەم باشترم، گوێ لە دەنگی باڵندەکان دەگرم. پاشان دەچمەوە ماڵەوە." هەندێ جار چەندین رۆژ تێدەپەڕێ، بەبێ ئەوەی هەر هیچ بیر لە ژاپۆنییەکان بکاتەوە، بەڵام هەر کە رووخسارێکی ئاشنا لەسەر جادە دەبینێ، بە خۆی دەڵێ، خۆ ئەوە میسز (نیشیکاوا)ی دوکانی ماسیفرۆشییەکەیە، بەڵام ئەدی بۆچی دەستیم بۆ راناوەشێنێ؟ بەڵام وەک با پڕوپاگەندەیەکی نوێ دێ و دەگوترێ. *تفەنگێکی لەچاڵنراو لەژێر دارهەڵوژەکەی (کویانگی)دا دۆزراوەتەوە. نیشانێکی بلاک دراکون لە ماڵێکی ژاپۆنیدا لە ئواک دۆزراوەتەوە.* یاخود لەدوای خۆیەوە لەسەر پیادەرۆکە؛ گوێی لە تەپەی پێیە، بەڵام کاتێ ئاوڕ دەداتەوە، کەس نابینێ. ئەوسا هەمدیس نیگەرانی دای دەگرێتەوە و دەڵێ:

*ژاپۆنییەکان جێیان هێشتووین و ئێمەش نازانین لەکوێن.*

کاتێ یەکەم زوقم دەکەوێ، ڕووخساری ژاپۆنییەکان لە زەینماندا کاڵ دەبێتەوە و دەسڕدرێتەوە. ناوەکانیانمان بیر دەچنەوە. ئەرێ ئەو پیاوە ناوی میستەر (کاتو) بوو، یان میستەر ساتو؟ چیدی نامەیانمان پێ ناگەن. منداڵەکانمان کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەوەندە بەزەبر بیریان دەکردن، چیدی پرسیارمان لێ ناکەن لەکوێن. تەنها گەنجەکان بەحاڵ ئەوانیان بیر دێنەوە. پێمان دەڵێن: "وا بزانین جارێک لە جاران بینیومانن." یان دەڵێن: "باشە ئەوان قژیان ڕەش نەبوو؟" پاش ماوەیەک سەرنج دەدەین ئێمە خۆیشمان هەرچی زیاتر بە ڕابردوو باسیان دەکەین. هەندێ ڕۆژ هەر تەواو ئەوەمان لەبیر دەچێتەوە، کە ئەوان ڕۆژێک لە ڕۆژان لێرە لای ئێمە بوون، بەڵام درەنگانێکی شەو بەزۆری بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو یادەوەرییان خۆی بە خەونەکانماندا دەکا. کوڕی (ئێلیوت)ی خاوەن مەشتەلەکە لە خەونماندا دەبینین. پێمان دەڵێ نیگەران نەبین. خواردنیان باشە و بەدرێژاییی ڕۆژ خەریکی یاریی بەیسبۆڵن. بەڵام کاتێ بۆ بەیانی لەخەو وەئاگا دێینەوە، چەندێک زۆر بۆ خۆمان دێنین لە خەیاڵماندا گلیان بدەینەوە، بەڵام بەنگ نابن و نامێننەوە.

ساڵێک دواتر هەر هەموو ئاسەوارێکی ژاپۆنییەکان لە شارەکەماندا بزر دەبن. ئەستێرەی ئاڵتونی لە پەنجەرەکانماندا ڕووەو جادە دەدرەوشێنەوە. بێوەژنانی گەنجی مێرد-لە-جەنگدا کوژراو، عارەبانەی ساواکانیان لە پارکەکەدا دەهاژوون. لە توولەڕێ سێبەردارەکانی درێژاییی ئەستێرکەکەدا، سەگ بە پەتی درێژەوە، بە خۆبادانەوە دەڕۆن. لە خوارەوە، لە ناوەندی شار، لە ماین ستریت، گوڵەلالەی جێژنی پاک چرۆ دەکا. (نیو لایبرەری چوپ سوی) پڕە لە کرێکارانی فراڤین خۆری کەشتیسازییەکە. سەربازان کە بە مۆڵەت هاتوونەتەوە ماڵەوە، بە جادەکاندا دەسووڕێنەوە و (پارادیس هۆتێل) جمەی دێت. (فلاوەرس

بای کای) ئێستا بووەتە (فولیس سپریت شۆپ). چینییەک بە ناوی وۆنگ، جێگەی هارادای بەقاڵی گرتۆتەوە، بەلام دەڵێی سیۆێکن و کراون بە دوو لەتەوە، هەر کاتێ بەلای جامی دوکانەکەیدا تێدەپەڕین، کتومت هەر دەڵێی جارانە. بەلام میستەر هارادا چیدی لە ناوماندا نییە و ئەودوای ژاپۆنیەکانیش دیار نین. ئێستە بەدەگمەن یان هەرگیز باسیان ناکەین، ئەگەرچی جاروبار هێشتا پڕوپاگەندەیەکمان لە دیوی ئەودیوی چیاوە لەبارەیانەوە پێ دەگا - لە بیابانەکانی (نیڤادا و ئوتا)وە: ژاپۆنییەکان شارگەلێکیان ڕۆ ناون، ژاپۆنییەکان لە ئیداهو خراونەتە بەر ئیش و چەوەندەر دەرنن، لە (یومینگ)یش گروپێک منداڵی ژاپۆنی، لەرزان و برسی، تاریکەوەخت لە دارستانێکەوە دێنە دەرێ. بەلام هەموو ئەوانە تەنها وتیوتین و بۆی هەیە هیچیان ڕاست نەبن. تاقە شتێک کە لێی دڵنیاین، ئەوەیە ژاپۆنییەکان لەوێ لە جێگەیەکن، لەم شوێن یان لەو شوێنن و دەشێ هەرگیز جارێکی تر لەم دونیایەدا نەیانبینینەوە.

## کتێبە چاپکراوەکانی ئەندێشە

1. بنەرەتەکانی فەلسەفە-حەمید عەزیز
2. کورد لەدیدی رۆژهەلاتناسەکانەوە (چ ٢)-فەرهاد پیربال
3. رێبازە ئەدەبییەکان (چ ٢)-فەرهاد پیربال
4. مۆزەخانەی پاکیزەیی-ئۆرهان پامۆک- و.بەکر شوانی
5. نەتەوەی ژێرابەکان-جەبار جەمال غەریب
6. ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی (چ٢)-جەعفەر عەلی
7. سۆفیزم و کاریگەری لەسەر بزوتنەوەی رزگاری خوازی...-جەعفەر عەلی
8. مەحوی لەنێوان زاهیرییەت و باتینییەت و... (چ٢)-ئەحمەدی مەلا
9. نهێنییەکانی ژیان-ئۆشۆ-و. ئازاد بەرزنجی
10. کورتیلەیەک لە مێژووی کات -ستیڤن هۆوکینگ و لیۆنارد ملۆدیتۆ-و. حوسەین حوسەینی و هیوا عومەر
11. کۆشک-فرانتس کافکا-و. عەتا نەهایی
12. فەصلول مەقال- ئیبن روشد-و. مەریوان عەبدول
13. شۆرشی ئەیلوول لەبەلگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا-وریا رەحمانی
14. دەسەلات و جیاوازی-مەریوان وریا قانع
15. لە چ ئێستایەکدا دەژین-مەریوان وریا قانع
16. شوناس و ئالۆزی-مەریوان وریا قانع
17. سیاسەت و دونیا-مەریوان وریا قانع
18. جەمشید خانی مامم-بەختیار عەلی
19. کەشتی فریشتەکان (کتێبی١)-بەختیار عەلی
20. کەشتی فریشتەکان (کتێبی٢)-بەختیار عەلی
21. لە دیارەوە بۆ نادیار-بەختیار عەلی
22. وەک بالندەی ناو جەنگەلە ترسناکەکان-بەختیار عەلی
23. چێژی مەرگدۆستی-بەختیار عەلی
24. مەعریفە و ئیمان-بەختیار عەلی و هێمن قەرەداخی
25. دۆزی کورد لە بازنەی پەیوەندییەکانی ئەمریکاو...- گۆران ئیبراهیم صالح

٢٦. سەمەرقەند (چ٢)-ئەمین مەعلوف-و. ئەحمەدی مەلا
٢٧. وێستگەیەک لە گەشتێکی فەلسەفی-فاروق ڕەفیق
٢٨. ئەخلاقناسی-تەحسین حەمە غریب
٢٩. گەشەسەندنی ڕامیاری...-د. ک. پێسچانی-و. د. ئارام عەلی
٣٠. مێژووی کۆنی کورد (چ٢)-جەمال ڕەشید فەوزیە ڕەشید-و. ملکۆ کەلاری
٣١. منداڵانی گەڕەک-هیوا قادر
٣٢. مرۆڤی یاخی-ئەلبێر کامۆ-و. ئازاد بەرزنجی
٣٣. پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان هەرێم و دەوڵەتانی...-هێرش جەوهەر مەجید
٣٤. مێژووی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و سیاسی... (چ٢)-فریشتە نورائی-و. هەورامان فەریق کەریم
٣٥. سلێمانی لەنێوان ساڵانی (١٩٤٥-١٩٥٨)-توانا ڕەشید کەریم
٣٦. شاری سلێمانی (١٤ی تەموزی ١٩٥٨-١٧ی تەموزی ١٩٦٨)-هەوراز جەوهەر مەجید
٣٧. کتێبی پەراوێزنووسان-عەتا محەمەد
٣٨. فیکر و دونیا (بەرگی ١)-مەریوان وریا قانع
٣٩. فیکر و دونیا (بەرگی ٢)-مەریوان وریا قانع
٤٠. دین و دونیا (چ٢)-مەریوان وریا قانع
٤١. کتێب و دونیا (چ٢)-مەریوان وریا قانع
٤٢. کۆمەڵگەی ڕەش-د. عادل باخەوان
٤٣. زستانێکی درێژ-کولم تویبێن-و. دلاوەر قەرەداغی
٤٤. فرانسیسکۆس قەدیسی من (چ٢)-نیکۆس کازانتزاکیس-و. دلاوەر قەرەداغی
٤٥. ئاهەنگی تەگەکە-ماریۆ بارگاس یۆسا-و. جەلیل کاکەوەیس
٤٦. شەوی لیشبۆنە-ئێریش ماریا ڕیمارک-و. کەریم پەڕەنگ
٤٧. من و ئەو-ئەلبێرتۆ مۆرافیا-و. کارزان عەلی
٤٨. میرنامە (چ٢)-جان دۆست-و. سەباح ئیسماعیل
٤٩. ڕووخسارە بەندکراوەکەم-لەتیفە-و. ڕووناک شوانی
٥٠. قەپێلک-مستەفا خەلیفە-و. هەورامان وریا قانع
٥١. خەونی پیاوە ئێرانییەکان و کەوتنی بۆرە قەلا-و. ماردین ئیبراهیم
٥٢. گرگن-پێر لاگەرکڤیست-و. خەبات عارف
٥٣. ١٩٨ (چ٢)-جۆرج ئۆروێل-و. حەکیم کاکەوەیس
٥٤. سوور و ڕەش-ستاندال-و. سیامەند شاسواری
٥٥. دەستنووسە دۆزراوەکەی ئەکرا-پاولۆکۆیلۆ-و. سیروان مەحمود
٥٦. جادەی مێخەک (١)-دلاوەر قەرەداغی
٥٧. جادەی مێخەک (٢)-دلاوەر قەرەداغی
٥٨. ئێوارستان-پێر لاگەرکڤیست-و. خەبات عارف
٥٩. دارستانی نەرویجی-هاروکی موراکامی-و. تارا شێخ عوسمان
٦٠. ئێوارەی پەروانە (چ٦)-بەختیار عەلی

٦١. شاری مۆسیقاره سپییه‌کان (چ٣)-به‌ختیار عه‌لی
٦٢. مه‌رگی تاقانه‌ی دووه‌م (چ٥)-به‌ختیار عه‌لی
٦٣. کۆشکی باڵنده غه‌مگینه‌کان (چ٢)-به‌ختیار عه‌لی
٦٤. تا ماته‌می گوڵ.. تا خوێنی فریشته (چ٣)-به‌ختیار عه‌لی
٦٥. سێوی سێهه‌م (چ٣)-به‌ختیار عه‌لی
٦٦. ئاوره‌که‌ی ئۆرفیۆس-به‌ختیار عه‌لی
٦٧. غه‌زه‌لنوس و باغه‌کانی خه‌یاڵ (چ٢)-به‌ختیار عه‌لی
٦٨. ئه‌ی به‌نده‌ری دۆست، ئه‌ی که‌شتی دوژمن (چ٢)-به‌ختیار عه‌لی
٦٩. دواهه‌مین هه‌ناری دونیا (چ٥)-به‌ختیار عه‌لی
٧٠. ئێمه‌ی په‌نابه‌ر-کۆمه‌ڵێ نووسه‌ر
٧١. گره‌وی به‌ختی هه‌ڵاڵه (چ٢)-عه‌تا نه‌هایی
٧٢. عێراقییه‌ک له‌ پاریس-سه‌مۆئێل شه‌معون-و. سه‌باح ئیسماعیل
٧٣. جیهانی سۆفیا و فه‌رهه‌نگی سۆفیا (چ٤)-یۆستاین گارده‌ر-و. به‌هرۆز حه‌سه‌ن
٧٤. کچه‌ی پرته‌قاڵ (چ٥)-یۆستاین گارده‌ر-و. به‌هرۆز حه‌سه‌ن
٧٥. له‌ ئاوێنه‌یه‌کدا، له‌ نهێنییه‌کدا (چ٢)-یۆستاین گارده‌ر-و. به‌هرۆز حه‌سه‌ن
٧٦. کچی به‌ڕێوه‌به‌ری سێرک (چ٢)-یۆستاین گارده‌ر-و. به‌هرۆز حه‌سه‌ن
٧٧. نهێنی یاری کاغه‌ز (چ٢)-یۆستاین گارده‌ر-و. به‌هرۆز حه‌سه‌ن
٧٨. مایا (چ٢)-یۆستاین گارده‌ر-و. به‌هرۆز حه‌سه‌ن
٧٩. ئینسایکلۆپیدیایه‌کی مێژوویی وێنه‌دار-کۆمه‌ڵێ نووسه‌ر-و. هه‌ورامان وریا قانع
٨٠. فه‌لسه‌فه‌ی بوون-د. محه‌مه‌د که‌مال
٨١. وه‌ک ڕووباره‌ به‌خوڕه‌که-پاولۆ کۆیلۆ-و. سیروان مه‌حمود
٨٢. دیارییه‌ مه‌زنه‌که-پاولۆ کۆیلۆ-و. سیروان مه‌حمود
٨٣. سیشه‌ممان له‌ گه‌ڵ مۆری-میچ ئه‌لبۆم-و. جوتیار ژاژڵه‌یی
٨٤. دوالیزمی دژ یه‌ک له‌ هۆنراوه‌ لیریکییه‌کانی مه‌ولانای ڕۆمی و...-لهۆن قادر عه‌بدولره‌حمان
٨٥. ڕووناک وه‌ک ئه‌وین، تاریک وه‌ک مردن-مه‌مه‌د ئوزون-و. وریا غه‌فووری
٨٦. کاندید-ڤۆلتێر-و. به‌یان سه‌لمان
٨٧. باوکه‌ گۆریۆ-به‌لزاک-و. ئه‌حمه‌دی مه‌لا
٨٨. زێبرا-جه‌بار جه‌مال غه‌ریب
٨٩. منداڵی سووتاو-ستیگ داگه‌رمان-و. دلاوه‌ر قه‌ره‌داغی
٩٠. وڕێنه-ئه‌نتۆنیۆ تابوکی-و. عه‌تا محه‌مه‌د
٩١. مردن له‌ ڕوانگه‌ی ئایینه‌کانه‌وه-بوساحه ئه‌حمه‌د-و. دانا مه‌لا حه‌سه‌ن
٩٢. گوێ بگره‌، پیاوی بچووک (چ٤)-ویلهێلم ڕایش- و.خه‌بات عارف
٩٣. ڕێبه‌ری کتێبسازه‌ کوژراوه‌کان-عه‌تا محه‌مه‌د
٩٤. کچه‌ فیلم گێڕه‌ره‌وه‌که-هێرنان ڕیڤێرا لێتێلییێر-و. عه‌تا محه‌مه‌د
٩٥. باوکی ئه‌و-په‌رینوش سه‌نیعی-و. ڕووناک شوانی

٩٦. داوێنپیسی-پاولۆکۆیلۆ-و. سیروان مەحمود
٩٧. کیمیاگەر (چ٢)-پاولۆکۆیلۆ-و. سیروان مەحمود
٩٨. رۆژهەڵاتی عەدەن، رۆژئاوای خودا-محەمەد ماغوت-و. حسەین لەتیف و کارزان عەلی
٩٩. خۆشی پیشەی من نییە (چ٢)-محەمەد ماغوت-و. حسەین لەتیف و کارزان عەلی
١٠٠. خیانەت لە نیشتمانەکەم دەکەم-محەمەد ماغوت-و. حسەین لەتیف و کارزان عەلی
١٠١. رۆژژمێری کیژۆڵەیەک-ئان فرانک-و. عەلی عوسمان یاقووب
١٠٢. جیهانی رۆمان-دکتۆر هاشم ئەحمەدزادە
١٠٣. نەفرەت لە دۆستۆیڤسکی (چ٢)-عەتیق رەحیمی-و. ئازاد بەرزنجی
١٠٤. قایدۆن (چ٢)-ئەفلاتون-و. ئاوات ئەحمەد سوڵتان
١٠٥. گۆر گیاس (چ٢)-ئەفلاتون-و. ئاوات ئەحمەد سوڵتان
١٠٦. سیاتیتۆس-ئەفلاتون-و. ئاوات ئەحمەد سوڵتان
١٠٧. مەسیح لە خاچ دەدەنەوە (چ٢)-نیکۆس کازانتزاکیس-و. دلاوەر قەرەداغی
١٠٨. تۆ مەچۆ بۆ شەڕ (چ ٢)-ماردین ئیبراهیم
١٠٩. سەگوەڕ (چ ٧)-محەمەد موکری
١١٠. چاوەکانی (چ١٠)-بوزورگ عەلەوی-و. ئازاد بەرزنجی
١١١. A-6171 من لە ئاوشفیتز دەرباز بووم-فێرێنک گوێندوێر-و. عەتا محەمەد
١١٢. باراباس-پێر لاگەرکڤیست-و. خەبات عارف
١١٣. تۆڵە (چ ٥)-محەمەد موکری
١١٤. سڵاو؟ کەس لەوێیە؟ (چ٢)-یۆستاین گاردەر-و. سیروان مەحمود
١١٥. هیچ-کۆچەر ئەبوبەکر
١١٦. هەورەکانی دانیال-بەختیار عەلی
١١٧. ئێمە زەریامان بەزاند-جولی ئوتسوکا-و. دلاوەر قەرەداغی

ENDÉŞE